# دوورگەی گەنجینە

# Treasure Island


نوسینی

ڕۆبێرت لویس ستیڤنسن


**ئینگلیزی-کوردی**


وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

خالد غفار نامق



چاپی یەکەم

٢٠١٢

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە: (٣٩٩)**

# ناسنامەی کتێب


- **ناوی کتێب: دوورگەی گەنجینە**
- **نوسەر: ڕۆبێرت لویس ستیڤنسن**
- **وەرگێڕ: خالد غفار نامق**
- **تایپ و هەڵەچن: وەرگێڕ**
- **دیزاین و بەرگ: فواد کەولۆسی**
- **شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج**
- **نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم-٢٠١٣**
- **تیراژ: ١٠٠٠ دانە**

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (      )ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.

ناونیشان

**سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.**

**ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)**




بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشەکی وەرگێڕ:**

خوێنەرانی خۆشەویست ئەم وەرگێڕانە سوودێکی زۆری هەیە بۆ ئەو خوێنەرانەی کە دەیانەوێت فێری زمانی ئینگلیزی ببن، چونکە خوێندنەوە یەکێکە لەڕێگا سەرکەوتووەکانی فێربوونی زمان. بەخوێندنەوەی تێکستە کوردییەکە و تێکستە ئینگلیزییەکە دەتوانیت خۆت ڕابهێنیت لە چۆنیتی تێگەیشتن لە نوسینێك کە بەزمانی ئینگلیزی نوسرا بێت.

ئاشکرایە لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا تەکنەلۆجیا کاریگەرییەکی گەورەی بەجێهێشتووە لەسەر خوێنەران لەهەموو شوێنێکدا، بەلام هێشتا جیهانی خوێندنەوە گرنگی خۆی لەدەست نەداوەو ئەگەر چی تەکنەلۆجیا کار ئاسانی زۆری کردووە بۆ خوێندنەوەی هەزاران کتێب، بەلام خوێندنەوەی کتێب لە کۆمپیوتەرو ئامێری ئەلیکترۆنی تام و چێژی ڕاستەقینەی خوێندنەوە نابەخشێت بە خوێنەر وەك خوێندنەوەی پارچەنوسینێك کە ئەلیکترۆنی نەبێت.

**سەبارەت بە هەر ڕەخنەو پێشنیارێك دەتوانن پەیوەندیمان پێوە بکەن بۆ دەوڵەمەند کردنی وەرگێڕانەکە.**

**وەرگێڕ**

**هاوینی ٢٠١٢**

khalid.namiq@yahoo.com

٠٧٧٠٣٥٥٤٦٤٣

**کەلار**

## Episode 1: The Old Sailor
## The Old Sailor comes to The Adimral Benbow

I remember him as if it were yesterday. He came slowly to the door of The Admiral Benbow Inn, his sea-chest following behind him on a hand-cart. He was a strong, heavy man with long scar from a sword across one cheek.

## زنجیرەی یەکەم: دەریاوانە بە تەمەنەکە
## دەریاوانە بە تەمەنەکە دێت بۆ خانەی ئەدمیراڵ بێنبەو

ئەو دەریاوانەم لە بیرە هەروەك بڵێی دوێنێ بووە. دەریاوانەکە بە هێواشی هات بۆ لای دەرگای خانەی (ئەدمیراڵ بێنباو)، و سندوقە گەورەکەشی (کە شت و مەکەکانی تێدابووە) بە عەرەبانەیەکی دەستی لەدوای خۆیەوە کەسێك هەڵیگرتبوو. ئەو دەریاوانە پیاوێکی بەهێز و قورس بوو هەروەها قژی ڕەش بوو و چاکەتێکی شینی کۆنەی پۆشیبوو. دەستەکانی ڕەق و ڕەش و پیس بوون، هەرودها زامێك (برینێك) لەسەر یەك گۆنای هەبوو کە بە شمشێر بریندار کرابوو.

He knocked on the inn door and, when my father opened the door, called roughly for a glass of rum. 'This is a pleasant, quiet bay for an inn; he said and looked slowly round him at the cliffs and our inn. 'Here, mate!' he cried to the man with the hand-cart, help me to get my chest inside'.

دەریاوانەکە لە دەرگای خانەکەی داو کاتێك باوکم دەرگاکەی کردەوە، دەریاوانەکە بە توندی داوای پەرداخێك خواردنەوەی ڕەمی کرد. دەریاوانەکە ووتی: ئەمە کەنداوێکی هێمن و خۆشە بۆ خانە، پاشان بەهێواشی سەیری دەوروبەری خۆی و کەندەڵانەکان و

**خانەکەمانی کرد. دەریاوانەکە هاواریکرد بۆ ئەو پیاوەی کە عارەبانەکەی بۆ هەلگرتبوو: "هاورێ لێرەوە! " یارمەتیم بدە سندوقەکەم بێنمە ژوورەوە،**

He continued, Rum and simple food is what I want. Oh, I see what you want, he said with a fierce look, and threw down three or four gold coins in front of him.

**دەریاوانەکە هەر بەردەوام بوو لە قسەکردن و ووتی: خواردنەوەی ڕەم و خواردنی سادە ئەو شتانەیە کە من دەمەوێت.هەروەها ئەو کەندەڵانەی سەرەوە کە لەوێدا دەتوانم تەماشای کەشتیەکان بکەم". پاشان بە سەیرکردنێکی توندوتیژییەوە ووتی: دەتوانن بە کاپتن بانگم بکەن،ئاه دەزانم چیت دەوێت،ئینجا سێ یان چوار پارەی ووردەی ئالتوونی فڕێدایە بەردەمی خۆی.**

All day he was around the bay, or up on the cliffs with his telescope. All evening he sat in the by the fire drinking rum. Mostly he did not speak when spoken to, but looked up suddenly and angrily, and we learnt to stay away from him.

**بەدرێـژایی ڕۆژ لـە دەوروبـەری کەنداوەکـە دەبـوو یـان لەسـەر کەندەڵانـەکان بـە تلیسکۆپەکەیەوە. بە درێژایی ئێوارانیش لەناو خانەکە دادەنیشت لە نزیك ئاگرەکـەو ڕەمی دەخواردەوە.زۆربەی جار قسەی نەدەکرد کاتێك قسەی بۆ بکرایە،بەڵام لەناکاودا بەتوڕەییەوە تەماشایەکی دەکرد و بۆیە ئێمـەش فێربـووین کـە خۆمـانی لـێ بـەدوور بگرین.**

He was very nervous of other sailors who came to the inn. One day he quietly promised to give me a silver fourpenny coin every month if I would keep an eye open for a seaman with one leg'.

ئەو دەریاوانە زۆر پەست بوو لە دەریاوانەکانی تر کە دەهاتنە خانەکە.ڕۆژێك دەریاوانەکە بە بێدەنگی پەیمانی پێدام کە هەموو مانگێك یەك پارەی ووردەی زیوم پێدەت ئەگەر چاودێری دەریاوانێك بکەم کە یەك قاچی هەیە.

The captain often drank too much rum and sang his old, wild sea-songs. Then he used to hit hand down hard on the table for silence, before telling his frightening stories of the sea. They were about hangings, storms at sea and terrible crimes.

کاپتنەکە بەزۆری ڕەمی زۆر دەخواردەوە و گۆرانیە کۆنە دەریاییە شەڕەنگێزەکانی دەوتەوە.ئینجا واڕاهاتبوو دەستەکانی بەتوندی بداتە سەر مێزەکە بۆ بێدەنگی پێش ئەوەی چیرۆکە ترسناکەکانی دەریا بگێڕێتەوە. چیرۆکەکانی دەریاوانەکە دەربارەی لەسێدارەدان و ڕەشەباکانی دەریاو تاوانە ترسناکەکان بوون.

During the months that the old sailor stayed with us, my father became very ill. One day Dr. Livesey came to see him, and before he left, the smart, bright doctor sat in the same room as our dirty, heavy sailor, who suddenly started his usual song:

بە درێژایی ئەو مانگانەی کە دەریاوانەکە لەگەڵمان مایەوە،باوکم زۆر نەخۆش کەوت.ڕۆژێك دکتۆر لڤسی هات بۆ بینینی باوکم بەمەبەستی چارەسەرکردنی، پێش ئەوەی دکتۆر لڤیسی بڕوات،دکتۆر لڤیسی زیرەك و ژیر لە هەمان ژوور دانیشت کاتێك کە دەریاوانە بەهێز و پیسەکەمان لەناکاوە دەستی کرد بە ووتنی گۆرانیە باوەکەی؛

‘Fifteen men on the dead man’s chest-
Yo-ho-ho, and a bottle of rum!
Drink and the devil had done for the rest-

*پانزە پیاو لەسەر سندوقی پیاوە مردووەکە*
*یۆ-هۆ-هۆ، بوتڵێکی ڕەم!*
*بخۆرەوە و شەیتانەکە( بەدکارەکە ) ئەوانی تری کوشت-*
*یۆ-هۆ-هۆ، بوتڵێکی ڕەم!*

Later on, he banged his hand on the table, which we all knew was a call for silence. Everyone apart from Dr. Livesey, stopped talking. A few moments later the captain cried; silence'.

**دواتر، دەریاوانەکە بەدەستەکانی کێشای بەسەر مێزەکە، کە هەموومان زانیمان ئاماژەیەکە بۆ بێدەنگی. هەموو کەسێك جگە لە دکتۆر لڤیسی لە قسەکردن وەستان. پاش چەند ماوەیەکی کەم کاپتنەکە هاواریکردو ووتی :" بێدەنگبە".**

If you were talking to me,sir; said Dr. Livesey. 'I have one thing to say-if you go on drinking so much rum, then the worl will soon be free of a very dirty old scoundrel! The captain jumped to his feet and took a knife out of his pocket.

**دکتۆر لڤیسی ووتی "ئەگەر لەگەڵ منتە بەڕێز" ئەوە یەك شتم هەیە بیلێم-ئەگەر بەردەوام بیت لەسەر خواردنەوەی ڕەمی زۆر، ئەوە زۆر بە خێرایی جیهان ڕزگاری دەبێت لە خراپەکارێکی بەتەمەنی پیس!" پاشان کاپتنەکە بازیدایە بەردەم پێیەکانی دکتۆرەکەو لە باخەڵی چەقۆیەکی دەرهێنا.**

The doctor did not move, but spoke slowly; I am a man of the law-a magistrate-as well as a doctor. If you do not put that knife away, you will go to the next court, and will be hanged'. A few uncomfortable moments passed, until the

captain finally put the knife in his pocket and sat down heavily.

دکتۆرەکەش جوڵەی نەکرد و بەهێواشی قسەی کرد و بە کاپتنەکەی ووت: من پیاوی یاسام-دادوەری پلە نزم-هەروەها دکتۆریشم.ئەگەر ئەو چەقۆیە لانەبەیت،ئەوە دەڕۆیتە بەردەم دادگا و لە سێدارە دەدرێیت". پاش تێپەڕ بوونی چەند ماوەیەکی ناخۆش،لە کۆتاییدا کاپتنەکە چەقۆکەی خستەوە گیرفانی و بە قورسی دانیشت.

## Black Dog

It was early one January morning, while the captain was out at the beach with his telescope, that the inn door opened and a man stepped in who I had never seen before. He wore a sword in his belt, his skin was an unpleasant colour and two fingers were missing from his left hand.

**سەگە ڕەشەکە**

**سەرلەبەیانییەکی یەکی کانونی دووەم، لەوکاتەی کاپتنەکە لە دەرەوە بوو لە کەنار دەریاکە بە تلیسکۆپەکەیەوە، دەرگای خانەکە کراوە بوو پاشان پیاوێك هاتە ژوور کە هەرگیز پێشتر نەمبینیبوو.ئەو پیاوە شمشێرێکی بەستبوو بە قایشەکەی و ڕەنگی پێستی ڕەنگێکی ناشرین بوو، هەروەها دوو پەنجەی نەمابوو لە دەستی چەپی.**

He sat down at a table, then called me closer. 'Is this here table for my mate, Bill? He asked, a strange look on his face.

**پاشان لەسەر مێزەکە دانیشت و بانگی کردم بە تەماشاکردنێکی نامۆوە پرسیاری کرد و ووتی: " ئەمە مێزی بیلی هاوڕێمە؟"**

I said that the table was for a man who we called the captain.
'Well', he said, my mate would be called the captain, probably. He has a cut on one cheek and he's very pleasant when he's drunk, is my mate Bill. So, is he here?
I told him he was out walking.

**منیش ووتم :ئەمە مێزی پیاوێکە ئێمە بە کاپتن بانگیمان کردووە. پیاوەکـەش ووتــی: زۆرباشە، هاوڕێکەم لەوانەیە بە کاپتن بانگ کرابێــت، ئــەو هاوڕێیــەم زامێــك لەســەر**

**یەکێك لە گوناکانیەتی و کاتێك سەرخۆشە زۆر جوان دەردەکەوێت،ئەوە بیلی هاوڕێمە،ئایا لێرەیە؟".منیش پێم ووت کە کاپتنەکە لە دەرەوە بوو پیاسەی دەکرد.**

'Well', he replied, you and me will just get behind the door, and we will give Bill a little surprise'. He made me hide and I became very worried when I saw him take out his sword.

**پاشان پیاوەکە وەلامی دایەوەو ووتی:"زۆرباشە،من و تۆ لە پشت دەرگای خانەکە دەبین و بیل تووشی سەرسوڕمان دەکەین" پیاوەکە منی شاردەوەو منیش زۆر پەرۆش بووم کاتێك پیاوەکەم بینی شمشێرەکەی دەرهێنا.**

At last, the captain came in and walked towards his breakfast table.

'Bill', said the stranger. The captain turned to face us. His face turned white.

'Come, Bill, you know me-your old shipmate-surely', said the man. The captain's eyes opened wide and he said, Black Dog'.

**لە کۆتاییدا کاپتن هاتە ژوورەوەو بەرەو مێزی قاوەڵتییەکەی ڕۆشت.پیاوە نامۆکەش بانگی بیلی کرد و ووتی؛ "بیل".کاپتنیش ئاوڕی دایەوەو سەیری ئێمەی کرد و دەموچاوی سپی بوویەوە.پیاوەکەش ووتی:" وەرە بیل،تۆ دەمناسیت-هاوڕێ دەریاوانە کۆنەکەتم.چاوەکانی کاپتن کرانەوە (واتە زاق بوون) و بە پیاوەکەی ووت:" سەگە ڕەش"**

'That's right, Black Dog, come to see his old shipmate Billy. Ah, we've seen some times together since I lost these two fingers', he said, holding up his hand.

پیاوەکەش بە کاپتنی ووت:" زۆر ڕاستە،سەگە ڕەشەکە هاتووە بۆ بینینی بیلی هاوڕێ دەریاوانە کۆنەکەی.ئاە،ماوەیەك پێکەوە بووین لەوکاتەی ئەم دوو پەنجەیەم لەدەستدا.

I brought them some rum and then left the room. At first I could only hear low voices, but then they became louder. Then all of a sudden, there was loud swearing and I heard something crash to the floor. There was the sound of metal against metal, and then a cry of pain.

منیش هەندێ ڕەمم بۆ هێنان و لە ژوورەکە بەجێیانم هێشت.سەرەتا گوێم لە دەنگی نزم بوو لە نێوان کاپتن و پیاوەکە،بەڵام ئینجا دەنگیان بەرزتر بوو.ئینجا لەناکاوە بەدەنگی بەرز جنێودان هەبوو لەنێوانیان و گوێم لە شتێك بوو بە دەرگاکەی کێشا.دەنگی ئەو قاپ و قاچاخ و کەلوپەلانە دەهات کە دەیانگرتە یەکتری ، پاشان هاواری ئازار هاتە بەرگوێم.

The next moment, I saw Black Dog running away, with the captain close behind. They were both carrying swords and Black Dog had blood streaming from his shoulder. But Black Dog was faster than the captain and he was soon outside and over the hill.

پاشان دواتر بینیم سەگە ڕەشەکە ڕادەکات و کاپتنیش دوای کەوتووە.هەردووکیان شمشێرەکانیان دەرهێنا بوو،برینێکی خوێن هەبوو لەسەر شانی سەگە ڕەشەکە،بەڵام سەگە ڕەشەکە لە کاپتن خێراتر بوو،بۆیە بەخێرایی پێش کاپتن ڕۆشتە دەرەوەو لەسەر گردەکە بوو.

The captain came back into the inn and said: Jim, rum!' but as he spoke, he started to fall against the wall.

'Rum', he repeated. I have to get away from here'.
I ran to get the rum. While I was in the next room, I heard a crash. I ran in and found him lying on the floor. The captain was breathing very loud and hard. His eyes were closed and his face was a horrible colour.

کاپتنەکە گەڕایەوە ناو خانەکەو ووتی؛ "جیم ڕەمم دەوێت" بەڵام هەرکە کاپتن قسەی کرد،یەکسەر بەڕووی دیوارەکە کەوت. پاشان کاپتنەکە دووبارە ووتی:"ڕەم،دەبێت ئێرە بەجێبهێڵم".منیش ڕامکرد بۆ هێنانی خواردنەوەی ڕەم.کاتێك لە ژوورەکەی تر بووم گوێم لە دەنگێکی پیاکێشان بوو.کاتێك هاتمە ژوورەوە بینیم کە کاپتن کەوتۆتە سەر زەوی.کاپتنەکە زۆر بە سەختی و دەنگی بەرز هەناسەی دەداو چاوەکانی داخرابوون و ڕەنگی دەمووچاوی زۆر ترسناك بوو.

My mother had now come downstairs, but we did not know what to do. At that moment Dr. Livesey came in, on his way to see my father.
'He's made himself very ill with too much rum, but I'll do my best to save his life', said the doctor when he had looked at him.

دایکم هاتە خوارەوە لە قادرمەکان،بەڵام نەمانزانی چی بکەین.لەوکاتە دکتۆر لڤیسی هاتە ژوورەوە بۆ سەردانی باوکم.کاتێك دکتۆرەکە چاویکەوت بە کاپتن ووتی؛" ئەو دەریاوانە زۆر نەخۆشە بەهۆی خواردنەودی زۆری ڕەم،بەڵام من باشترین هەوڵی خۆم دەدەم ژیانی ڕزگار بکەم.

The doctor pulled off the captain's shirt to start his work and I saw several tattoos on the captain's arm. They read: here's luck', 'A fair wind', and 'Billy Bones'.

It was some time later before the captain opened his eyes. First he looked around the room, and then he tried to get up, crying; Where's Black Dog?'

دکتۆرەکە قەمیسەکەی کاپتنەکەی لابرد بۆ ئەوەی دەست بکات بە چارەسەرکردنی، منیش هەندێ تاتۆم بینی لەسەر باڵی کاپتن.کە نوسرابوو: "لێرە بەخت هەیە" "شنەبای خۆش هەیە" و "بیلی بەونز". دواتر پێش ئەوەی کاپتن چاوەکانی بکاتەوە. یەکەمجار کاپتنەکە سەیری دەوروبەری ژوورەکەی کردو هەوڵیدا هەستێ، پاشان هاواری کرد: "سەگە ڕەشەکە لە کوێیە؟

There's no Black Dog here', replied the doctor. 'You've been drinking rum and you've had a stroke. Now what I have to say to you is this. One glass of rum won't kill you. But if you take one, you will take another, and if you don't stop, you'll die. Come on, now. I'll help you to your bed'.

دکتۆریش وەڵامی دایەوە: "سەگە ڕەشەکە لێرە نیە. تۆ زۆر ڕەمت خواردۆتەوەو جەڵتەی مێشکت هەیە. ئێستا ئەوەی پێویستە بیڵێم ئەوەیە خواردنەوەی یەك پەرداخ ڕەم ناتکوژێت، بەڵام ئەگەر یەك پەرداخ بخۆیتەوە ئەوە دانەیەکی تریش دەخۆیتەوە، وە ئەگەر واز نەهێنیت ئەوە دەمریت. دەی ئێستا وەرە با یارمەتیت بدەم بۆ سەر جێگای نوستنەکەت.

We managed to get him upstairs and onto his bed. 'He should lie in bed for a week', said the doctor as soon as we had closed the door. That's the best thing for him, and you. But another stroke would finish him off'.

کاپتنەکەمان بردە سەرەوە بۆ سەر جێگای نوستنەکەی. کاتێك دەرگاکەمان داخست دکتۆر لڤیسی پێی وتین: "پێویستە کاپتن یەك هەفتە لەناو جێگە بێت ئەمەش باشترین شتە بۆ دەریاوانەکەو تۆ. بەڵام یەك جەڵتەی مێشکی تر دەیکوژێت".

## The black spot

At about midday I went to see the captain. He seemed both weak and excited. 'Jim', he said, every month I've given you a silver fourpenny'. You'll bring me a little drink of rum now, won't you?'

'The doctor....' I began.

## خاڵە ڕەشەکە

لە دەوروبەری نیوەڕۆدا ڕۆشتم بۆ بینینی کاپتن.بینیم کاپتن لاواز و دڵخۆش دیارە.کاپتن ووتی:"جیم من هەموو مانگێك یەك پارەی ووردەی زیوم پێداوی.ئێستا کەمێك خواردنەوەی ڕەمم بۆ دێنێت،نایهێنیت بۆم؟منیش ووتم:" دکتۆر لڤیسی......."

He started to swear and then said, what does that doctor know about life at sea? I've lived on rum, I tell you. Your doctor said himself one glass wouldn't hurt me. I'll give you a golden guinea for some, Jim'.

پاشان کاپتنەکە دەستیکرد بە جنێودان و ووتی:" ئەو دکتۆرە چی دەزانێت دەربارەی ژیانی دەریا؟" من لەسەر خواردنەوەی ڕەم ژیاوم.دکتۆرەکە خۆی نەیگوت یەك پەرداخی ڕەم ئازارم نادات.جیم یەك جونیەی ئاڵتونیت پێدەبەخشم بۆ کەمێك خواردنەودی ڕەم.

'I want what you owe my father. That's all', I said (for he had been very slow to pay us). 'I'll get you one glass, and no more'.

When I brought it to him, he took it quickly and drank it down.

'Aye', he said, that's better. How long do I have to lie here?

'A week, at least', I said.
'I can't do that!' he cried.

منيش ووتم:ئەو پارەیەم دەوێت کە قەرزداری باوکمی.ئەوە هەموو شتێکەو تەواو.( چونکە کاپتنەکە قەرزداری ئێمە بوو بەڵام زۆر کەمترخەم بوو لە گێڕانەوەی قەرزەکەمان ).بە کاپتنەکەم ووت:تەنها یەك پەرداخت بۆ دێنم و ئیتر بۆت ناهێنم.کاتێك پەرداخە ڕەمەکەم بۆ هێنا،بەخێرایی وەریگرت و خواردییەوە. پاشان ووتی:بەڵێ،ئەوە باشترە،دەبێت ماوەی چەندێك لێرە پاڵکەوم؟ منیش ووتم:بەلای کەمەوە یەك هەفتە.کاپتنەکەش هاواریکرد ووتی:"ناتوانم یەك هەفتە پاڵکەوم!.

But he was too weak to get up, and he lay back for a while in silence.

'Jim', he said after a time, it's my old sea-chest they want. If I can't get away, you go to-well, yes-you go to the doctor. Tell him to bring the magistrates here to The Admiral Benbow to get all of old Flint's crew, all of'em that's left.

بەڵام کاپتنەکە زۆر لاواز بوو هەستێت،بۆیە بەبێدەنگی پاڵکەوتەوە بۆ ماوەیەك. پاش کەمێك ووتی: جیم،ئەوە سندوقە کۆنەکەمە کە دەیانەوێت.ئەگەر نەتوانم دوور بکەومەوە،ئەوە تۆ بڕۆ-زۆرباشە-بەڵێ-دەڕۆیت بۆلای دکتۆر لڤیسی و پێی دەڵێی دادوەرە پلە نزمەکان بێنێتە ئێرە بۆ خانەی ئەدمیراڵ بێنبەو بۆ دەست بەسەرداگرتنی هەموو دەست و پێوەندە کۆنەکانی فلنت.

I was Flint's first mate and I'm the only one that knows the place. He gave it to me when he was dying. But don't tell the doctor unless they get the black spot on me, or unless you see that Black Dog, or the sailor with one leg'.
But what is the black spot, captain? I asked.

من بەرزترین پلەی ئەفسەری دەریایی فلنت بووم لە پاش فلنت و تەنها کەسێکم کە شوێنی خەزێنەکان دەزانم.کاتێك فلنت مرد ئەو سندوقەی پێدام.بەلام بە دکتۆر لڤیسی مەڵێ تاکو دەست و پێوەندەکانی فلنت پەڵە ( خاڵە ) ڕەشەکەم بۆ دێنن یان تاکو ئەو سەگە ڕەشە یان دەریاوانێکی یەك قاچ دەبینیت".
منیش پرسیارم کرد:"پەڵە ڕەشەکە چییە کاپتن؟

'That's a sort of warning, mate. If I get the black spot, it means they are coming to get me and I've got. Keep your eyes open, Jim, and I'll give you half of everything, I promise you'.

کاپتنیش ووتی:پەڵە ڕەشەکە نیشانەی ئاگادارکردنەوەیە هاوڕێ.ئەگەر پەڵە ڕەشەکەیان بۆ هێنام ئەوە مانای وایە دەست و پێوەندەکانی فلنت دێن بۆ گرتنی خۆم و شتەکانم.جیم چاوەکانت باکراوە بێت (چاودێری بکە)،نیوەی سامانەکەم پێت دەبەخشم پەیمانت پێدەدەم.

But my poor father died quite suddenly that evening. All of the neighbours came to visit and there was a lot to arrange, so I was too busy and upset to think of the captain.
The following day the captain came downstairs, ate a little and got himself some rum. On the night before we buried my father he was as drunk as ever.
بەلام ئەو ئێوارەیە باوکە هەژارەکەم لەناکاوە مرد،هەموو دراوسێکان هاتن بۆ سەردانمان و کارێکی زۆر هەبوو بەرێوەی ببەم،بۆیە زۆر مەشغوڵ و بێتاقەت بووم بیر لە کاپتنەکە بکەمەوە.ڕۆژی دواتر کاپتنەکە هاتە خوارەوەو کەمێك خواردنی خوارد و هەندێك ڕەمی بۆ خۆی هێنا.لە شەوەکەیدا پێش ئەوەی باوکم بنێژین کاپتنەکە وەك پێشوو سەرخۆش بوو.

He sat at the table with his sword ready in front of him, singing his ugly old sea-songs. But he was still very weak, and seemed to be getting worse, not better.
Several days later, on a cold, foggy afternoon, I was standing at the door full of sad thoughts about my father. As I stood there I saw someone coming slowly along the road.

**کاپتنەکە بە شمشێرەکەیەوە لەبەردەستی لەسەر مێزدکە دانیشتبوو،هەروەها گۆرانیە دەریاییە کۆن و ناخۆشەکانی دەوت.بەڵام کاپتنەکە هێشتا زۆر لاواز بوو کە خراپتر دەبوو باشتر نەدەبوو. پاش چەند ڕۆژێك لە ئێوارانێکی تەماوی ساردا،لەلای دەرگاکە وەستا بووم کە پڕ بووم لە بیرکردنەوەی خەمباری سەبارەت بە باوکم.کاتێك لەوێ ڕاوەستا بووم کەسێکم بینی بەهێواشی لەڕێگاکەوە دێت.**

The man was blind-he was walking along tapping a stick in front of him. He wore a cloth over his eyes and nose and was bent over. I had never in my life seen such a terrible-looking man. He stopped a little way from the inn, and he said in aloud voice; Will any good man tell a poor man where he is?'

**پیاوەکە کوێر بوو-هەروەها گالۆکێکی پێبوو کە بەهۆیەوە پێی دەڕۆیشت.پارچە پەڕۆیەك لەسەر چاوەکانی و لوتی بوو،هەروەها پشتی چەماوە بوو.هەرگیز لە ژیانمدا پیاوێکی ترسناکی لەو شێوەیەم نەبینیبوو. پاشان پیاوە کوێرەکە کەمێك دوور لە خانەکەوە وەستاو بەدەنگێکی بەرز ووتی:"کەسێك بە پیاوێکی کوێری هەژار دەڵێت کە لەکوێیە؟**

'You are at The Admiral Benbow,' I replied.
'Give me your hand, young friend, and lead me in', he said.

I held out my hand and the horrible man held it hard. He pulled me up close to him and said; Now, boy. Take me in to the captain'.

منیش وەڵامم دایەوە: " تۆ لە خانەی ئەدمیراڵ بێنبەوی".
پیاوە کوێرەکەش پێی ووتم: "دەستم بدەرێ هاوڕێی گەنج،و بمبە ژوورەوە".
دەستەکانم دەرکرد و پیاوە ترسناکەکەش بەتوندی دەستەکانمی گرت و بۆلای خۆی ڕایکێشام وووتی: "ئێستا کوڕەکە بمبە بۆلای کاپتن".

'Sir', I said; I can't. The captain is not what he used to be. He sits with his sword ready...' Take me in or I'll break your arm', he said and pulled my arm roughly. It was the hardest. coldest voice I had ever heard. I was so frightened that I led him into the room where the captain was sitting.

منیش ووتم: "بەڕێز ناتوانم،کاپتن وەك پێشوو نیە،کاپتن بە شمشێرەکەیەوە دانیشتووە....". پیاوە کوێرەکەش ووتی: "دەمبەیتە ژوور یان دەستت بشکێنم.منیش زۆر ترسام و بردمە ئەو ژوورەی کە کاپتنی تیادا دانیشتبوو.

The poor captain lifted his head, and it was easy to see that he was very frightened. 'Now Bill, sit where you are', said the man; Hold out your left hand. Boy, take his left hand and bring it near my right hand'.

کاپتنە داماوەکەش سەری بەرز کردەودو زۆر بە ئاسانی دیاربوو کە کاپتن زۆر ترسابوو. پیاوە کوێرەکەش ووتی: "ئێستاکە بیڵ دانیشە لەو شوێنەی کە لێی،دەستی چەپت دەرکە،کوڕەکە (واتە جیم) دەستی چەپی کاپتن بگرەو بیهێنە بۆ دەستی ڕاستم".

We both did what we were told, and I saw him put something into the captain's hand, which quickly closed on .

The blind man suddenly went out of the door. I stood without moving and heard his stick go tap-tapping down the street.

پاشان من و کاپتن بە گوێی پیاوەکەمان کرد. بینیم کە پیاوە کوێرەکە شتێکی خستە ناو دەستی کاپتن کە بەخێرایی دایخست. لەناکاوە پیاوە کوێرەکە ڕۆشتە دەرەوە لە دەرگاکە. منیش بەبێ جوڵە وەستام و گوێم لە دەنگی تەپەی گاڵۆکی پیاوە کوێرەکە بوو کە لەسەر شەقامەکە دەڕۆیشت.

The captain looked down into his hand. Ten o'clock!' he cried. I've got six hours', he said and tried to stand up. But he suddenly put his hand to his neck, and then, with a strange sound, fell face first onto the floor.

I shouted my mother, but it was too late. The captain was dead.

کاپتنەکە تەماشای کاغەزەکەی ناو دەستی خۆی کردو هاواری کردو ووتی: "کاتژمێر ١٠". شەش کاتژمێرم ماوە"، پاشان هەوڵیدا هەستێتە سەرپێ. بەڵام لەناکاوە دەستی خستە سەر ملی و ئینجا بەدەنگێکی نامۆوە بە دەمە (لەسەر ڕوو) کەوتە سەر زەوی. منیش هاوارم کرد بۆ دایکم، بەڵام زۆر درەنگ بوو، کاپتن بیلێ مردبوو.

## Episode 2: Everything changes at the inn
## The sea chest

I told my mother everything. We were very frightened and did not
know what to do. If I went to see Dr. Livesey as the captain had told me to do, I would have to leave my mother alone, and her safety was my priority. On the other hand, it also seemed too dangerous for us to stay at the inn.

**زنجیرەی دووەم**

**هەموو شتێك دەگۆڕێت لە خانەكە**

**سندوقەكە دەریاییەكە**

**هەموو شتێكم بەدایكم ووت.ئێمەش زۆر ترساین و نەمانزانی چی بكەین.ئەگەر بڕۆشتایەم بۆلای دكتۆر لڤیسی هەروەك كاپتن پێی ووتم،ئەوە دەبوایە دایكم جێبهێشتایە بە تەنهاو سەلامەتی دایكیشم لە هەموو شت گرنگتر بوو بۆ من.لەلایەكی ترەوە،زۆر ترسناك دیاربوو بۆ من و دایكم لە خانەكە بمێنینەوە.**

At last we decided what we ought to do. First we needed to go to the nearest village to get help, then we would come back to open the chest and take the money the captain owed us before anyone else came for it.

**لە كۆتاییدا بڕیارماندا ئەو شتە بكەین كە پێویستە بیكەین.یەكەمجار پێویست بوو بڕۆین بۆ نزیكترین گوندەكە بۆ داوای یارمەتی و ئینجا بگەڕێینەوە بۆ خانەكە بۆ كردنەوەی سندوقی كاپتنەكە بۆ بردنی ئەو بڕە پارەیەی كە كاپتنەكە قەرزداری ئێمە بوو، پێش ئەوەی هیچ كەسێكی تر بێت بۆ سندوقەكە.**

But when we got to the village no one wanted to return with us to The Adimral Benbow. Some of the men had heard of the terrible captain Flint, and others had seen strange men on the road that day, as well as a ship in a nearby bay. They were all too frightened to leave their houses.

بەڵام کاتێك گەیشتینە گوندەکە یەك کەس نەیویست لەگەڵمان بگەڕێتەوە بۆ خانەکە. هەندێك لە پیاوانی گوندەکە سەبارەت بە کاپتن فلنتی ترسناك شتیان بیستبوو، هەروەها پیاوانی تری گوندەکە لەو ڕۆژەدا هەندێك پیاوی نامۆیان بینیبوو لەسەر ڕێگاکە، هەروەها کەشتیەکیان بینیبوو لەناو کەنداوەکەی نزیك گوندەکە. هەموو پیاوانی گوندەکە زۆر ترسابوون ماڵەکانیان بەجێبهێڵن.

We decided to go back to the inn alone to carry out our plan. One man gave me a gun in case we were attacked, and a boy said he would ride to the doctor's house to get help.When we arrived back at the inn, nothing had changed. We locked the door, lit a candle and, holding each other's hands, we walked into the room where the captain lay.

من و دایکم بڕیارماندا بە تەنها بگەڕێینەوە بۆ خانەکە بۆ جێبەجێکردنی پلانەکەمان. یەکێك لە پیاوەکانی گوندەکە دەمانچەیەکی پێدام بۆ بارودۆخێك کە ئەگەر هێرش کرایە سەرمان، کوڕێکیش کە خەڵکی گوندەکە ڕایگەیاند کە دەڕوات بۆ ماڵی دکتۆر لڤیسی بۆ داوای یارمەتیکردن. کاتێك گەیشتینەوە خانەکە، هیچ شتێك نەگۆڕابوو. ئێمەش دەرگاکەمان قوفڵ کرد و مۆمێکمان داگیرساند و دەستی یەکترمان گرت و ڕۆشتینە ئەو ژوورەی کە کاپتن تیایدا پاڵکەوتبوو.

I went down on my knees. On the floor near the dead man's hand was a small, round, black piece of paper-the

black spot. I picked it up. Written on one side were the words; You have till ten tonight'.

**لەسەر ئەژنۆ چەمامەوەو لەسەر زەوییەکە لە نزیك دەستی کاپتنە مردووەکەوە پارچە کاغەزێکی ڕەشی بچوکی خڕ هەبوو-کە پەڵە (خاڵە) ڕەشەکە بوو-منیش هەڵم گرت. لەلایەکی کاغەزەکەوە ئەم ووشانە نوسرابوو: "تاکو کاتژمێر١٠ی شەوت ماوە".**

Luckily for us it was still only six o'clock. I anxiously looked in his pockets for the key to the chest, but I found nothing. Then, finally, I saw it on a piece of string around his neck. I cut the string and we went quickly upstairs to find the chest.

**خۆشبەختانە بۆ ئێمەش کاتژمێر تەنها شەش بوو. بە پەرۆشییەوە بەدوای کلیلی سندوقەکە گەڕام لە باخەڵەکانی کاپتنە مردووەکە، بەڵام هیچم نەدۆزییەوە. ئینجا لە کۆتاییدا کلیلەکەم بینی کە بە پارچە دەزوویەك بوو لە ملی کاپتنەکە. دەزوودکەم بڕی و بەخێرایی ڕۆشتینە سەرەوە بۆ دۆزینەوەی سندوقەکە.**

It was old and well-used like any other sailor's chest and it had the letter **'B'** burnt on it. 'Give me the key', said my mother, and although the lock was difficult to open, she turned it and opened the lid in a moment.

**سندوقەکەش هەروەك سندوقی دەریاوانەکانی تر کۆن و باش بەکارهاتوو بوو، هەروەها پیتی (ب) لەسەر نوسرابوو (کە بەشێوەی سوتاندن پیتی-ب-لەسەر نوسرابوو). دایکم ووتی: کلیلەکەم بدەرێ، هەرچەندە کلیلی سندوقەکە بە سەختی کرایەوە، بەڵام دایکم سندوقەکەی هەڵگەڕانەوەو کلیلەکەی کردەوە.**

At the top there was a carefully folded suit. Under that, there were too many things to count-some pistols, a large piece of silver, an old Spanish watch and many more small objects. At the very bottom of the chest lay a packet covered in cloth, and a heavy bag that held gold coins.

لەناو جانتاکە لەسەرەوە چاکەت و پانتۆڵێکی پێچراو هەبوو،لەژێرەوەشی زۆر شت هەبوو بیژمێری-هەندێ دەمانچەو برێکی زۆری زیو و کاتژمێرێکی کۆنەی ئیسپانی و زۆر شتی تریشی تیابوو.لە بنی سندوقەکە پاکەتێک بە قوماشێک داپۆشرابوو،هەروەها جانتایەکی قورسی لێبوو کە پارەی ووردەی ئاڵتونی تێدابوو.

'Let's take what he owed us', said my mother', and not a penny more'. And she began to count out the coins. It was a long difficult hob because the coins were all of different countries and sizes. When we had counted out about half of our money, I suddenly heard the tap-tapping of the blind man's stick on the road.

دایکم ووتی؛"با ئەو برە پارەیەی لێ ببەین کە قەرزارمان بووە،و یەك پاردی زیاتر نابەین.ئینجا دایکم دستیکرد بە ژماردنی پارە ووردەکان.
ئیشێکی درێژخایەن و سەخت بوو چونکە پارە ووردەکان هی وولاتی جیاواز بوون و قەبارەکانیشیان جیاواز بوو.کاتێك نیوەی پارە ووردەکەمان ژمارد لەجیاتی برە قەرزەکەمان،لەناکاوە گوێم لە دەنگی تەپەی گاڵۆکەکەی پیاوە کوێرەکە بوو لەسەر ڕێگاکە.

We sat holding our breath. Then the stick banged on the inn door, and we heard the handle being turned, and then silence. At last the tapping started again, but this time it became quieter and quieter as the man walked away.

ئێمەش دانیشتین و هەناسەمان گیراو،ئینجا زرمەی گاڵۆکەکە هات کە پیاوە کوێرەکە لە دەرگای خانەکەیدا بە گاڵۆکەکەی،بیستمان کە دەسکی دەرگای خانەکە لەرییەوەو خولایەوە-ئینجا بێدەنگییەك هات.لە کۆتاییدا تەپەی گاڵۆکەکە دووبارە دەستپێکردەوە،بەڵام ئەمجارەیان بێدەنگتر و بێدەنگتر بوو کاتێك پیاوە کوێرەکە دوورکەوتەوە.

Not long after that, we heard a whistle blow far up on the hill. That was enough for us. 'I haven't counted enough to pay his bill, but I'll take what I have', she said, jumping to her feet.

پاش ئەوە ئەوەندەی نەبرد گوێمان لە دەنگی فیکەیەك بوو کە لە سەر گردەکەوە هات.ئەوەش بەس بوو بۆ ئێمە.دایکم بازیدا و ووتی:"ئەوەندە پارەی پێویستم نەژمارد بۆ وەرگرتنەوەی قەرزی کاپتنەکە،بەڵام ئەوەی پێمە دەییەم".

'And I'll take this instead of the rest of the money', I said, picking up the packet covered in cloth.We went as quickly as we could down the dark stairs and out onto the road. We were on our way back to the village when we heard the sound of someone running, first in the distance and then getting nearer.

منیش ئەو پاکەتەی بە قوماشەکە داپۆشرابوو هەڵمگرت و ووتم:"ئەمە دەبەم لە جیاتی باقی قەرزەکەی تری کاپتنەکە".بەخێرایی تا توانیمان لە قادرمە تاریکەکە هاتینە خوارەوەو ڕۆشتینە دەرەوە بۆ سەر ڕێگاکە.بەڕێگاوە بووین بۆ گوندەکە کاتێك گوێمان لە دەنگی کەسێك بوو ڕایدەکرد لە دوورەوە ئینجا نزیکتر بوویەوە.

'You must take the money and run on. I feel I'm going to faint'. my mother said, and then she fell on my shoulder.

Luckily, we were near a little bridge, and with some difficulty, I managed to pull her under it.

**دایکم ووتی: "دەبێت پارەکە ببەیت و ڕاکەیت، وا هەستەکەم دەبورێمەوە"، ئینجا دایکم هاتە سەرشانم و خۆشبەختانە لە نزیکی پردێکی بچووك بووین و بە هەندێ ناڕەحەتییەوە دایکم لە ژێر پردەکە دانا (واتە دایکم ڕاکێشایە ژێر پردەکەوە).**

## The last of the blind man

Moments later, seven or eight men came running towards the inn. In front there were three men holding hands. Then in the weak moonlight, I could see that in between the other two was the blind man.

'Go in!' he cried.

## کۆتایی پیاوە کوێرەکە

دواتر، حەوت یان هەشت پیاو بەڕاکردن بۆلای خانەکە هاتن.لە پێشەوە سێ پیاو هەبوون دەستیان گرتبوو،ئینجا لە ڕووناکییە لاوازەکەی مانگدا توانیم لەنێوان دوو پیاوەکەی تر پیاوە کوێرەکە ببینم.

پیاوە کوێرەکە هاواریکرد: "بڕۆنە ژوورەوە".

Several men went to the door of the inn and, finding the door unlocked, went inside. Two of them stayed outside with the terrible blind man. There was a moment's silence, then a cry of surprise, and a voice shouting from the house; Bill's dead!' The blind man swore. Look in his pockets! Then find the chest! he cried.

چەند پیاوێك بەرەو دەرگای خانەکە ڕۆشتن و بینیان دەرگاکە کلیل نیەو ڕۆشتنە ژوورەوە. دووان لە پیاوەکان لە دەرەوە مانەوە لەگەڵ پیاوە کوێرە ترسناکەکە. چەند خولەکێکی بێدەنگی هەبوو، پاشان هاوارێکی سەرسام هەبوو، ئینجا دەنگێکی هاوارکردن لە ماڵەکەوە هات: "بیڵ مردووە!". پیاوە کوێرەکە جنێویداو هاواریکرد: "باخەڵەکانی بگەڕێن، ئینجا سندوقەکە بدۆزنەوە".

A little while later, one of the upstairs windows thrown open and someone shouted out to the blind man; Pew, someone's been in the chest'.

'Isn't it there?' Pew asked angrily.

پاش ماوەیەکی کەم،یەکێك لە پەنجەرەکانی سەرەوە کرایەوەو کەسێك هاواریکرد بۆ پیاوە کوێرەکە و ووتی:"پیو کەسێك لەلای جانتاکە بووە". پیو ( پیاوە کوێرەکە ) بە توڕەییەوە پرسیاریکرد:" ئەو جانتایە لەوێ نیە؟".

'The money's here, but there's none of Flint's writing', the man replied.
'It's these people of the inn, it's that boy. Why didn't I take his eyes out?' cried the blind man, Pew. They were here earlier, the door was locked when I came. Go and find them'.

پیاوەکەش وەڵامی دایەوەو ووتی:"پارەکە لێرەیە،بەڵام هیچ نوسینێکی فلنت لێرە نیە". پیاوە کوێرەکە هاواریکرد و ووتی:"ئەوە خەڵکی خانەکەن-ئەو کوڕەیە.بۆچی چاوەکانیم دەرنەهێنا؟ پێشتر لێرە بوونە-کاتێك من هاتم دەرگای خانەکە کلیل بوو.برۆ بیاندۆزەرەوە.

Just then came the whistle we had heard before, and it came from the direction of the village.
'Dirk's blown the whistle again!' said one of the men. That means he's seen someone coming. Let's leave!'

ئینجا یەکسەر دەنگی فیکەکە هات هەروەك پێشتر بیستمان لەسەر گردەکە،بەڵام ئەمجارە لە ئاراستەی گوندەکەوە هات.یەکێك لە پیاوەکان ووتی:"دەنگی فیکەی دیرکە دووبارە!"،مانای وایە دیرك کەسێکی بینیوە دێت.با بڕۆین".

'Keep looking!' Pew shouted angrily. The boy and his mother can't be far away. We almost have it, and you want to run away? You will be as rich as kings if we find it!'

پیاوە کوێرەکە ( پیو ) بە توڕەییەوە هاواریکرد:" بەردەوام بن لە گەڕان".کوڕەکەو دایکی زۆر دوور نین، نزیکە نوسراوەکەمان دەستکەوێت.ئێوەش دەتانەوێت رابکەن؟ وەکو پاشاکان دەوڵەمەند دەبن ئەگەر نوسراوەکە بدۆزینەوە!".

'Hang it Pew. Why don't we go? We've got the bag of money! Said one.Pew started trying to hit the men with his stick. As the fight went on, the sound of horses galloping came from the top of the hill. The sailors quickly stopped fighting and ran away, leaving Pew anxiously tapping up and down the road alone.

یەکێکیان ووتی: بێزاربووین پیو.بۆچی ناگەڕێینەوە (بۆ شوێنیان بکەوین)؟ جانتا پارەکەمان وەرگرتووە! پاشان پیو دەستیکرد بە لێدانی پیاوەکان بە گاڵۆکەکەی.هەرکە شەڕەکەیان بەردوام بوو،دەنگی غارغارێنی ئەسپەکان هات لە لوتکەی گردەکەوە.دەریاوانەکان بەخێرایی لە شەڕکردن وەستان و هەڵهاتن و پیویان بەجێهێشت کە بە پەرۆشییەوە لەسەر رێگاکە بە تەنها سەرو خواری دەکرد بە گاڵۆکەی.

Just then, four or five horses appeared in the moonlight, galloping down the hill towards the inn. Pew screamed and, not knowing in which direction to go, ran right under the first horse. Down he went with a terrible cry.

پاشان چوار یان پێنج ئەسپ لە رووناکی مانگەکەوە دەرکەوتن و بە غارغارێن لە گردەکەوە هاتنە خوارەوە بۆ خانەکە. پیو قیژاندی و نەیزانی بە کام ئاراستە بڕوات،بۆیە لەژێر یەکەم ئەسپەوە رایکرد و بە هاوارکردنێکی خراپەوە کەوت.

The horses came to a stop and I recognized the boy that had gone from the village to get Dr. Livesey. With him were several law officers who he had met on the way to the doctor's house.

ئەسپەکان وستان و ئەو کورەم ناسیەوە کە لە گوندەکەوە ڕۆشت بۆ بانگردنی دکتۆر لڤیسی.لەگەڵ کورەکەدا هەندێ ئەفسەری یاسایی هەبوون کە لەڕێگادا بۆلای دکتۆر لڤیسی چاوی پێیان کەوتبوو.

Pew was dead. We went back to find my mother and carry her to the village. There she recovered well after a little while. The law officers rode on to the nearby bay, but they were too late, the strange ship had already gone, and probably the rest of the pirates with it.

پیو مرد. ئێمەش گەڕاینەوە بۆ دۆزینەوەی دایکم و بیبەین بۆ گوندەکە.لەوێدا دایکم پاش ماوەیەکی زۆر کەم باشبوویەوە.ئەفسەرە یاساییەکان ڕۆشتن بۆ کەنداوە نزیکەکە،بەلام زۆر درەنگ کەوتن-کەشتیە نامۆکە پێشتر ڕۆشتبوو،لەوانەشە باقی چەتە دەریاییەکانی تریشی لەگەڵدا بوو بێت.

When the leader of the men, Mr. Dance returned from the bay, I told him everything that had happened.

'They wanted something more than the money, you say? Well then, Hawkins, what on earth were they trying to find? He asked me.

کاتێك سەرکردەی پیاوەکان بەڕێز دانس لە کەنداوەکە گەڕایەوە،هەموو شتێکم پێووت کە ڕوویدابوو.سەرۆکەکە پرسیاری لێکردم:"تۆ دەڵێی،ئەو چەتە دەریاوانە شتێکی زیاتریان دەویست لەچاو پارەکە؟ زۆرباشە،جیم هۆکینس،ئەو چەتانە هەوڵیانداوە چی بدۆزنەوە لەسەر زەوی؟

'I believe I have what they want in my pocket', I replied, and I would like to get it to Dr. Livesey, so that it will be safe'.

'Of course, boy', he said, Yes, I shall go there myself and tell him all about this. Why don't you come with me?'

**منیش وەڵامم دایەوەو ووتم: "پێم وابێت ئەو شتەم لایە لە باخەڵم کە چەتەکان دەیانەوێت، پێمخۆشیشە بیدەم بە دکتۆر لڤیسی بۆ ئەوەی سەلامەت بێت". سەرۆکەکەش ووتی: "بەدڵنیاییەوە وایە کوڕەکە، بەڵێ دەبێت خۆم بڕۆمە ئەوێ و دکتۆر لڤیسی ئاگادارکەمەوە لەمە". بۆچی نایەیت لەگەڵم؟**

## The captain's papers

We found Dr. Livesey at the Hall, where he was having dinner with the squire. A servant led us through the great house to the library, where both men were smoking their pipes next to the fire. The squire was a tall, strong man with eyebrows that were very black and moved a lot when he spoke.

## کاغەزەکانی کاپتنەکە

لە هۆڵەکە (ئەو شوێنەیە کە کەسێکی زۆر گرنگ خاوەنیەتی لە شوێنێکی ناوخۆیی) دکتۆر لڤیسیمان دۆزییەوە، کە لەوێدا لەگەڵ ئاغای ناوچەکە نانی ئێوارەی دەخوارد. خزمەتکارێك لەڕێگەی ماڵە گەورەکەوە (هۆڵەکە) بردمانی بۆ کتێبخانەکە کە لەوێدا هەردووکیان سەبیلیان (وەك جگەرە کێشان) دەکێشا لە تەنیشت ئاگردکەوە. ئاغا پیاوێکی بالابەرزو بەهێز بوو کە بڕۆکانی زۆر ڕەش بوون، هەروەها زۆر دەجولا کاتێك قسەی دەکرد.

'Come in, Mr. Dance', he said in a loud voice.

'Good evening', said the doctor. 'What brings you both here today?'

Mr. Dance stood up and told his story, and the two gentlemen listened with surprise and interest.

ئاغا بە دەنگێکی بەرز ووتی: " وەرە ژوورەوە بەڕێز دانس".

دکتۆر لڤیسی ووتی: "ئێوارەتان باش، چی ئەمڕۆ هەردووکتانی هێناوەتە ئێرە؟

مستەر دانس هەستایە سەرپێ و چیرۆکەکەی خۆی باسکرد و دوو پیاوە خانەدانەکەش بە سەرسامی و تامەزرۆییەوە گوێیانگرت.

'And so, Jim', said the doctor when Mr. Dance had finished, 'you have the thing they wanted?'

'Here it is, sir', I said and gave it to him. He held it for a moment and then put it carefully in his pocket.

**کاتێك بەڕێز دانس قسەکانی تەواو کرد، دکتۆر لڤیسی ووتی: کەواتە جیم تۆ ئەو شتەت لایە کە چەتەکان ویستیان".**

**منیش شتەکەم بە دکتۆر لڤیسی بەخشی و ووتم: "گەورەم ئەوە کاغەزەکەیە". دکتۆر لڤیسیش ماوەیەك کاغەزەکەی گرت و ئینجا بە ووریاییەوە خستیە باخەڵی.**

' Squire', he said, Mr. Dance will go home, but I think Jim Hawkins should stay at my house tonight and we should give him dinner'. And so I ate a wonderful dinner at the Hall while we talked.

**دکتۆر لڤیسی ووتی: کوێخا، مستەر دانس دەگەڕێتەوەماڵەوەو بەڵام پێم وابێت جیم هۆکینس دەبێت لە ماڵی من بمێنێتەوە ئەمشەو، وە پێویستە نانی ئێوارەی پێبدەین". پاشان لەوکاتەی لە هۆڵەکە قسەمان دەکرد، خواردنێکی زۆر خۆشم خوارد.**

'I've heard of this man Flint', said Mr. Trelawney, the squire. 'He was the most dangerous pirate that ever sailed. I have seen his ship, with terrible eyes painted on its sails'.

**مستەر تریلۆنی (واتە ئاغا) ووتی: "دەربارەی فلنتم بیستووە؟ فلنت ترسناکترین چەتەی دەریاییە کە تا ئێستا دەریاوانی کردبێت، کەشتییەکەیم بینیوە کە لەسەر چارۆکەکانی کەشتیەکەی وێنەی ترسناکی چاو کێشراوە".**

'But did he have money?' asked the doctor.

'Money!' cried the squire. Have not you heard the story of his treasure? What were those scoundrels looking for if not money?'

دکتۆر لڤیسی پرسیاریکرد: "بەڵام ئایا فلنت پارەی هەبووە؟". مستەر تریلۆنی هاواریکرد: "پارە!، ئایا چیرۆکی خەزێنەکەیت نەبیستووە؟ئەو خرا پەکارانە بەدوای چی دەگەڕێن ئەگەر پارە نەبێت؟

'Just tell me', replied the doctor, if I have information in my pocket about where Flint buried his treasure, what does that mean we should do?'

دکتۆر لڤیسی وەڵامی دایەوەو ووتی: "بەس پێم بڵێ، ئەگەر زانیاریم هەبێت لەسەر ئەوەی کە فلنت لە کوێ خەزێنەکانی حەشارداوە، ئەوە مانای چی دەبێت کە پێویستە ئەنجامیبدەین؟

'What does it mean? Cried the squire. 'If we have the information you're talking about, it means that I will go to Bristol and buy a ship, and we'll find that treasure if we have to spend a year looking for it'.

ئاغا هاواریکرد: "مانای چی دەگەیەنێت؟، ئەگەر ئێمە زانیاریمان هەبێت دەربارەی ئەو شتەی قسەی لەسەر دەکەیت، ئەوە مانای وایە کە من بۆ بریستۆڵ دەڕۆم و کەشتیەك دەکڕم، ئینجا ئەو خەزێنەیە دەدۆزینەوە ئەگەر ساڵێك بەدوای بگەڕێین.

'Very well', said the doctor and put the packet on the table in front of him. 'Now then, if Jim agrees, I will open the packet', and he started to open the cloth that covered it. Inside were two things; a book and a roll of paper. The book was full of names, numbers and dates.

**دکتۆر لڤیسی پاکەتەکەی لەسەر مێزەکە داناو ووتی: زۆرباشە، ئەگەر ئێستا جیم ڕازی بێت، ئەوە پاکەتەکە دەکەمەوە. پاشان دکتۆر قوماشەکەی لابرد کە بە پاکەتەکە پێچرابوو. لەناو پاکەتەکە دوو شت هەبوو: کتێبێك و پارچە کاغەزێکی لولکراو- کتێبەکە پڕ بوو لە ناو و ژمارەو بەروار.**

'This is Bill Bones' account book!' cried the squire. ' The names are the ships that he sank, and the numbers show the money he took from them'.

**ئاغا هاواریکرد ووتی: ئەمە دەفتەری حساباتی بیلْ بەونزە! ، ناوەکان ئەو کەشتیانەیە کە بیلْ نوقمی ناوی کردوون، ژمارەکانیش ئەو پارەیەیە کە بیلْ لە کەشتیەکانی بردووە.**

The doctor carefully opened the rolled-up paper and we saw a map of an island, complete with latitude and longitude, names of hills and bays, a large hill in the centre named 'The Spy-glass', and every detail that a captain would need to bring a ship in safely.

**دکتۆر لڤیسی بە وورياييەوە کاغەزە پێچراوەکەی کردەوەو نەخشەی دوورگەیەکمان بینی کە هێلی پانی و هێلی درێژی بەتەواوی تیابوو لەگەڵ ناوی گردەکان و کەنداوەکان و گردێکی گەورە لەناوەڕاستەوە بەناوی (سپای گلاس)، هەروەها هەموو وردەکارییەك کە کاپتن بیلْ پێویست بووە کەشتیەك بە سەلامەتی بهێنێت.**

There were three red crosses; one was in the south-west and had these words next to it; 'Bulk of treasure here'. The second red cross showed where some silver was buried, and the third some weapons. There were detailed notes and instructions on the back of the map.

سێ پەڕینەوەی سور هەبوو-دانەیەکیان لە ڕۆژئاوای باشور کە ئەم ووشانەی لە تەنیشتەوە بوو: زۆرترین ڕێژەی خەزێنە لێرەیە. دووەم پەڕینەوەی سور پیشانیداوە کە لە کوێ هەندێك زیو شاردراوەتەوە، سێیەم پەڕینەوەی سور بریتی بوو لە هەندێك چەك. تێبینی و ڕێنمایی وردەکار هەبوو لە پشتەوەی نەخشەکە.

I did not understand the map, but the squire and Dr. Livesey were very excited. 'By tomorrow evening I shall be in Bristol', said the squire.'Then in three weeks' time we'll be sailing the best ship, sir, with the most efficient crew in England.

لە نەخشەکە تێنەگەیشتم. بەڵام ئاغا و دکتۆر لڤیسی زۆر دڵخۆش بوون. ئاغا ووتی:لە بەیانی ئێوارەکەیدا دەبێت لە بریستۆڵ بم، پاشان لە ماوەی سێ هەفتەدا گەشتی دەریایی دەکەین لەگەڵ کاریگەرترین دەستەی دەریایی لە ئینگلاند.

Hawkins, you will be a cabin-boy, and you, Livesey, the ship's doctor. I will be the admiral! We will take my men, Redruth, Joyce and Hunter, too. We'll have good winds, a quick voyage, and no difficulty at all in finding the treasure, and more money than we can imagine'.

هەروەها ئاغا ووتی: "جیم تۆ دەبیت بە خزمەتکاری سەر کەشتیەکە، دکتۆر لڤیسی تۆش دەبیت بە دکتۆری کەشتیەکەو خۆشم دەبم بە ئەدمیراڵ! و پیاوەکانم دەبەین لەگەڵ ڕێدروث و جۆیس و هەنتەر. ئاوهەواکەشمان باش دەبێت و گەشتێکی دەریایی خێرا دەکەین و هیچ ناڕەحەتیەك لە دۆزینەوەی گەنجینەکە تووشمان نابێت، و زۆر پارەمان دەست دەکەوێت زیاتر لەوەی خەیاڵی لێدەکەینەوە".

'Trelawney'. said the doctor. 'I'll go with you. and I think Jim will too. But there's only one man I'm afraid of'.

'And who's that?' asked the squire with a troubled look on his face.

دکتۆر لڤسی ووتی: " تریلۆنی، من لەگەڵ تۆ دەڕۆم، پێم وایە جیم هۆکینزیش دێت. بەڵام تەنها کەسێك هەیە لێی دەترسم.

ئاغا (تریلۆنی) بە تەماشاکردنێکی ترسناکەوە ووتی: ئەو کەسە کێیە؟

'You', replied the doctor, 'because you can't keep a secret. We're not the only men who know about this document. Those men who attacked the inn tonight are not far away, I'm sure. And, according to Jim, they want that money. We must be very careful until we are on our way, and we must not say a word about this map to anyone'.

'Livesey', replied the squire, 'I'll be as silent as the grave'.

دکتۆریش وەڵامی دایەوە ووتی: لە تۆ دەترسم"، چونکە ناتوانی نهێنی بپارێزیت. ئێمە تەنها کەسێك نین دەربارەی ئەم شتە دەزانین. ئەو پیاوانەی کە ئەمشەو هێرشیان کردە سەر خانەکە من دڵنیام زۆر دوور نین. هەروەها بە پێی جیم ئەو پیاوانە ئەو پارەیان دەوێت کە ئێمە بۆی دەڕۆین. دەبێت زۆر وریا بین تاکو بەڕێگاوە دەبین بۆ خەزێنەکەو، نابێت هیچ قسەیەك بە کەسی تر بڵێین دەربارەی ئەم نەخشەی شوێنی خەزێنەیە.

ئاغا (تریلۆنی) وەڵامی دایەوەو ووتی: " لڤسی، من وەکو گۆڕ بێدەنگ دەبم".

## Episode 3: The sea-cook
## I go to Bristol

It took longer than three weeks until we were ready to go to sea. A ship was being prepared by the squire, and Dr. Livesey had been called away to London. During that time I lived at the Hall with old Tom Redruth, and spent hours looking at the map, imagining every detail and dreaming what would happen when we finally got to the island.

And so the weeks passed until one fine day a letter arrived:

## زنجیرەی سێهەم: چێشت لێنەرە دەریاییەکە
## دەڕۆم بۆ بریستۆڵ

زیاتر لە سێ هەفتەی خایاند تاکو ئامادەی ڕۆشتن بووین بۆ دەریا. ئاغا کەشتییەکی ئامادەکرد، دکتۆر لڤیسی بانگهێشت کرا بۆ لەندەن. بەدرێژایی ئەو ماوەیە لەگەڵ تۆم ڕێدروس لە هۆڵەکە ژیام و چەند کاتژمێرێك سەیری نەخشەکەم دەکرد و بیرم لە هەموو وردەکارییەکی نەخشە دەکردەوەو خەونی ئەوەم دەبینی کە دەبێت چی ڕوویدات لە کۆتاییدا کاتێك دەگەین بە دوورگەکە.

پاشان ئەو چەند هەفتەیە ڕۆشت تاکو ڕۆژێکی خۆش نامەیەك گەیشت، کە بەم شێوەیە بوو:

*Old Anchor Inn*
*Bristol*
*March 1st*

*Dear Hawkins,*

***The ship has been bought and is ready to go to sea. What a ship! She is easy to sail, weighs two hundred tonnes and her name is 'Hispaniola'.***

***My old friend, Blandly, helped me to get her. He worked so hard for me, and so, I must say, did everyone else in Bristol, as soon as they heard where we were going, to find the treasure, I mean.***

**خانەی ئەولد ئەنکەر ( خانەی لەنگەری کۆن )**

**بریستۆل،**

**ای ئازار**

**هۆکینزی خۆشەویست،**

**کەشتیەکەمان کڕیوەو ئامادەیە بۆ دەریا. چ کەشتیەکە!کەشتیەکە بە ئاسانی گەشتی دەریایی دەکات و کێشەکەی ٢٠٠ تەن دەبێت و ناوی هیسپانیۆلە.هاوڕێ کۆنەکەم،بلاندلی یارمەتیدام بۆ دەستکەوتنی (کڕینی) کەشتیەکە.بلاندلی زۆر بە جدی ئیشی بۆ کردم،بۆیە دەبێت بڵێم ئایا هەموو کەسێکی تر لە بریستۆل یارمەتیدام هەرکە بیستیان بۆ کوێ ڕۆشتوین،مەبەستم دۆزینەوەی خەزێنەکەیە.**

***Finding the crew was a problem at first, and I could only find a few men. But then, by luck, I met an older sailor. He has an inn, so he knows all the sailors in Bristol. He was ill for a while, but now he wanted to work as a ship's cook to get back to sea again. Long John Silver, he is called, and he has lost a leg.***

**دۆزینەوەی دەستەی دەریایی کێشە بوو لەسەرەتاوە،وە تەنها توانیم چەند پیاوێکی کەم بدۆزمەوە.بەڵام ئینجا بەرێکەوت چاوم کەوت بە دەریاوانێکی بە تەمەن کە خانێکی هەبوو،وە هەموو دەریاوانەکان دەناسێت لە بریستۆل.ئەو دەریاوانە بە تەمەنە**

نەخۆش بوو بۆ ماوەیەك،بەڵام ئێستا دەیەوێت وەك چێشتلێنەری کەشتی کاربکات و بگەڕێتەوە بۆ دەریا جارێکیتر.بە لۆنگ جۆن سیلڤەر بانگ دەکرێت و یەك قاچی لەدەستداوە.

*Poor man. I told him immediately that he would be our ship's cook. Well, I thought I had just found a cook, but in addition I had found a whole crew. He had soon found us a group of the toughest old sailors. He then got rid of the weakest two of the six or seven men I had already employed.*

منیش ڕاستەوخۆ پێم ووت؛پیاوی هەژار،دەبێت بە چێشتلێنەری کەشتیەکەمان. زۆرباشە،تەنها چێشتلێنەرێکم دۆزییەوە،بەڵام هەروەها دەستەیەکی تەواوی دەریاییم دۆزییەوە.پاشان ئەو پیاوە دەریاوانە بە تەمەنە (لۆنگ جۆن سیلڤەر) کۆمەڵێك تونلترین دەریاوانی بەتەمەنی بۆ دۆزینەوە،ئینجا هەستا بە لابردنی لاوازترین دوو پیاوی ئەو شەش پیاوە دەریاوانەی کە پێشتر من دام مەزراندن وەك دەریاوانی کەشتیەکەمان.

*I am very well, but I won't be happy until we are at sea, so both you and Redruth must come to Bristol tomorrow.*

*John Trelawney*

من زۆرباشم،بەڵام دڵخۆش نابم تاکو لە دەریا نەبین،کەواتە هەردووکتان تۆ لەگەڵ ڕێدروث دەبێت بەیانی بێن بۆ بریستۆل.

جۆن تریلۆنی

*P.S I forgot to tell you that Blandly (who will send a ship to look for us if we don't come back by the end of August)*

*has found us a captain. He is a little too serious, but in every other way he is an excellent man-a real treasure.*

***هەروەها لەبیرم چوو پێت بڵێم کە بلاندلی (کە کەشتیەك دەنێرێت بۆ گەڕان بەدوامان ئەگەر تاکو کۆتایی مانگی ئاب نەگەڕێینەوە) کاپتنێکی بۆ پەیدا کردووین.ئەو کاپتنە تاڕادەیك جدییە،بەڵام لە هەموو ڕێگاکانی تر پیاوێکی زیرەکە-خەزێنەیەکی ڕاستەقینەیە.***

'Trelawney has been talking to people', I said to Redruth. Dr. Livesey will not like that'. But I was very excited to hear the news that the ship was ready. The next day I said goodbye to my dear mother and the little bay where I had lived since I was born, and then Redruth and I left for Bristol in the evening.

**تریلۆنی بۆ خەڵکی قسەی دەکرد،منیش (جۆن) بە ڕێدروثم ووت:.دکتۆر لڤیسی حەز لەوە ناکات.بەڵام زۆر خۆشحاڵ بووم بۆ بیستنی ئەو هەواڵەی کە کەشتیەکە ئامادەیە بۆ گەشتکردنی دەریایی.ڕۆژی دواتر،خودا حافیزیم لە دایکم و کەنداوە بچوکەکە کرد،ئەو کەنداوەی کە تیایدا ژیاوم هەر لە دایکبونمەوە.پاشان من و ڕێدروث لە ئێوارەکەیدا ڕۆشتین بۆ بریستۆڵ.**

It was early the next morning when we arrived in the city and walked down to the docks to meet Trelawney. There were ships of all shapes, sizes and nationalities all along the quays. Sailors were singing at their work, some below and others high up in the rigging. Then suddenly, in front of a large inn, I saw Squire Trelawney, dressed like a smart sea-office.

**سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر کاتێك گەیشتینە ناو شارەکەو بە پیاسەکردن بەرەو شوێنی وەستان و بارکردنی کەشتیەکان ڕۆشتین بۆ بینینی تریلۆنی.هەموو جۆرە کەشتیەك هەبوو بە هەموو شێواز و قەبارەو نەتەوەکانیانەوە بەدرێژایی سەکۆی بەندەرەکان.دەریاوانەکان گۆرانیان دەووت لە ئیشەکانیاندا،هەندێ دەریاوان لە خوارەوەو ئەوانیتر لە سەرەوە بوون لەلای گوریس و زنجیری کەشتیەکان.ئینجا لەناکاوە لەبەردەم خانێکی فراواندا،ئاغا تریلۆنیم بینی کە وەك ئەفسەرێکی دەریایی قۆز خۆی پۆشیبوو.**

‘Here you are’. he cried, ‘and the doctor came last night from London. Bravo! The ship’s crew is complete. We sail tomorrow!’

**تریلۆنی هاواریکرد؛ تۆ لێرەی"،هەروەها شەوی ڕابردوو دکتۆر لڤیسی لە لەندەنەوە هات.ئافەرین! دەستە دەریاییەکانی کەشتییەکە تەواوە.بەیانی گەشتی دەریایی دەکەین!"**

-

## At The Spy-glass inn

After breakfast, the squire asked me to take a note to Long John Silver. He told me to go to The Spy-glass, an inn at the other end of the docks. I went gladly because I was pleased to be able to see the busy port and all the ships again.

## خانەی سپای گلاس ( تەلیسکۆپ )

پاش ڤاوەڵتی بەیانی،تریلۆنی داوای لێکردم نامەیەك ببەم بۆ لۆنگ جۆن سیلڤەر.تریلۆنی پێی ووتم برۆم بۆ سپای گلاس-کە خانێکە لە کۆتاییەکەی تری بەندەری بارکردنی کەشتییەکان.منیش بە خۆشحاڵییەوە رۆشتم چونکە دڵخۆش بووم بتوانم بەندەرە قەرەباڵغییەکە ( مەشغوڵ ) و هەموو کەشتییەکان دووبارە ببینم.

The inn was full of loud sailors, and I was almost too frightened to go inside. As I was waiting at the door I saw a man as he came out of a side a room, and I thought he must be Long John Silver. His left leg was cut off near the top, and under his left shoulder he carried a crutch, on which he moved about easily. He was very tall and strong, with an intelligent face, and he was serving the people at the tables with a smile.

خانەکە پڕ بوو لە دەریاوانی دەنگ بەرز،منیش ترسام برۆمە ژوور.کاتێك لە دەرگاکەوە چاوەڕێم کرد، پیاوێکم بینی کاتێك لە ژووری لایەکی خانەکە هاتە دەرەوە،منیش پێم وابوو دەبێت ئەوە لۆنگ جۆن سیلڤەر بێت.ئەو پیاوە کە لە ژوورەکە هاتە دەرەوە قاچی چەپی لە نزیك بن ڕانییەوە لەدەستدابوو،هەروەها لەژێر شانی چەپی دارشەقێکی ( گاڵۆك ) هەڵگرتبوو کە بەهۆیەوە بە ئاسانی دەڕۆیشت ( دەجوڵا ) بەڕێگادا.ئەو پیاوە زۆر درێژو بەهێز بوو،هەروەها دەموچاوێکی زیرەکی هەبوو ( واتە زیرەك دیاربوو ) و بە خەندەوە خزمەتی خەڵکی خانەکەی دەکرد لەسەر مێزەکان.

From the very first time I had read about Long John Silver in Trelawney's letter, I had been frightened that he might be the one-legged sailor that the captain had told me about. But one look at this man was enough. I had seen the captain, Black Dog, and the blind man Pew, and I thought I knew what a pirate was like-very different from this clean and pleasant inn-keeper.

هەر لە سەرەتاوە دەربارەی لۆنگ جۆن سیلڤەرم خوێندبووەوە لە نامەکەی تریلۆنی، ترسام کە لۆنگ سیلڤەر دەریاوانە یەك قاچەکە بێت کە کاپتن بیلْ لەبارەیەوە بۆی باسکردم. بەلاّم یەك سەیرکردنی ئەم پیاوە (لۆنگ جۆن) بەس بوو. کاپتن بیلْ و بلاك دۆگ (سەگە ڕەشەکە)و پیاوە کوێرەکە (پیو) م بینی بوو، هەروەها پێم وابوو دەزانم چۆن چەتە دەریاییەکە-کە چەتەی دەریایی زۆر جیاوازە لەم خاوەن خانە ڕووخۆش و باشە.

I walked closer to him, held out the note and said, 'Mr. Silver, sir?'

'Yes, my boy. And who are you?' he answered. I gave him the note. 'Oh!' he said, quite loudly and seeming surprised. 'you're the new cabin-boy. I'm very pleased to meet you'. Just then I noticed one of the men sitting on the other side of the room as he suddenly stood up and walked to the door. I recognized him at once.

بەرەو نزیکی خاوەن خانەکە بە پیاسە ڕۆشتم و نامەکەم دەرهێناو وتم: "گەورەم بەڕێز سیلڤەری؟

ئەویش وەلاّمی دایەوەو وتی: "بەلْێ کوڕم، تۆ کێی؟. منیش نامەکەم پێداو. ئەویش تاڕادەیك بە دەنگی بەرزو دەرکەوتنێکی سەرسامییەوە وتی: "ئۆه! تۆ کوڕە-خزمەتکارە تازەکەی سەر کەشتیەکەی. من زۆر خۆشحالْم بە ناسینت".

ئینجا هەرکە تێبینی یەکێك لە پیاوەکانم کرد لە لاکەی تری ژوورەکەوە دانیشتبوو کاتێك لەناکاوە هەستایە سەرپێ و بۆلای دەرگاکە ڕۆیشت، منیش یەکسەر ناسیمەوە.

'Hey!' I shouted. 'Stop him! It's Black Dog, he's one of the pirates!'

'I don't care who he is', cried Silver. 'But he hasn't paid for his drinks. Harry, run and catch him'.

A man near the door jumped up and ran out of the inn after him.

هاوارمکرد: " هێی، بیوەستێنن، ئەوە سەگە ڕەشەکەیە-ئەو یەکێکە لە چەتە دەریاییەکان".

لۆنگ جۆن سیلڤەریش ( خاوەن خانەکە ) هاواریکرد و ووتی: " گوێ بەوە نادەم کێیە، بەڵام پارەی خواردنەوەکانی نەدا. خێراکەن ڕابکەن و دەستگیری بکەن".

پیاوێك لە نزیکی دەرگاکەوە بوو، بازیداو لە خانەکە ڕایکردە دەرەوە بەدوای سەگە ڕەشەکە.

'Who did you say he was? A pirate? In my inn! I can't believe it!' said Silver, who was now very excited. 'Morgan!' he called to a man sitting in the bar. 'You were drinking with him. You have never seen him before, have you? You didn't know his name, did you?

لۆنگ جۆن سیلڤەر ئێستا زۆر دڵخۆشەو ووتی: " ووتت ئەوە کێ بوو؟ چەتەی دەریا؟ لە خانەکەی من! ناتوانم بڕوا بەمە بکەم!". پاشان لۆنگ جۆن بانگی پیاوێکی کرد لە نزیك بارەکەوە دانیشتبوو: " مۆرگان، تۆ لەگەڵ ئەو کابرایە ( سەگە ڕەشەکە ) دەتخواردەوە، ئایا پێشتر نەتبینیوە، بینیوتە؟ نەتزانی ناوی چی بوو، زانیت ناوی چی بوو؟

I had become worried when I found Black Dog at The Spy-glass, and I watched the cook very carefully. But he was too ready, and too clever for me. He laughed and joked with me, and said that I was a clever boy. By the time Harry had come back empty-handed and had been shouted at loudly by Silver, I felt sure that Silver was an honest man.

کاتێك سەگە ڕەشەکەم دۆزییەوە لە خانەی سپای گلاس بێتاقەت بووم،و سەیری چێشتلێنەرەکەم کرد بە وورياييەوە.بەڵام چێشتلێنەرەکە (سیلڤەر) ئامادەی من بوو، پێکەنی و گاڵتەی لەگەڵ کردم و ووتی کە من کوڕێکی زیرەکم.لەو کاتە هاری گەڕایەوە بەدەستی خاڵی و پاشان لۆنگ جۆن سیلڤەر هاواریکرد بەسەر هاری،منیش لەوکاتەدا هەستم بە دڵنیایی کرد کە لۆنگ جۆن سیلڤەر پیاوێکی ڕاستگۆ بوو.

A little while later, he took me back to see Trelawney and we walked by the quays together. He was very interesting, and told me all about the different ships that we passed, their rig, their weight and nationality and where they would sail.

پاش ماوەیەکی کورت،لۆنگ جۆن گەڕاندمیەوە بۆ بینینی تریلۆنی و پێکەوە لەلای بەندەری بارکردنی کەشتیەکان پیاسەمان کرد و ڕۆشتین.لۆنگ جۆن زۆر سەرنجڕاکێش بوو،و هەموو شتێکی پێ ووتم دەربارەی کەشتیە جیاوازەکان کە بەلایاندا تێپەڕین- هەروەها هەموو شتێکی پێووتم دەربارەی گوریس و زنجیری کەشتیەکان و کێش و نەتەوەکانیان و لە کوێ گەشتی دەریاییان پێکراوە.

Long John excitedly told the squire and the doctor the whole story. The two gentlemen said it was a shame that Black Dog had escaped, but we all agreed that nothing could

be done. As Long John left, the two gentlemen thanked him for his trouble.

لۆنگ جۆن به دڵخۆشیەوه هه موو چیرۆکەکەی به ئاغا تریلۆنی و دکتۆر لڤسی گووت.دوو پیاوه خانەدانەکەش (تریلۆنی و لڤیسی) ووتیان شەرمەزارییه که سەگه ڕەشەکه هەڵهاتووه،بەلام هەموومان ڕازی بووین که هیچ شتێك ناکرێت.کاتێك لۆنگ جۆن ڕۆیشت،دوو خانەدانەکه (تریلۆنی و لڤیسی) سوپاسی کێشەکەی لۆنگ جۆن سیلڤەریان کرد.

'Everyone on board by four this afternoon'. Shouted the squire after him.

'What a wonderful man!' said the squire and then turned to me. 'Now, come with us, Hawkins, and we'll see the ship'.

پاشان لەدوای ڕۆشتنی لۆنگ جۆن هاواریکرد ووتی:" له کاتژمێر چواری ئەم پاش نیوەڕۆیه هەموو کەسێك لەسەر کەشتییەکه بێت".تریلۆنی ووتی:" چ پیاوێکی سەرنجڕاکێش بوو". پاشان تریلۆنی ئاوڕی دایەوه بۆلای من و ووتی:" ئێستاکه وەره لەگەڵمان جیم هۆکینس و کەشتییەکه دەبینین".

## Captain Smollett

As we climbed aboard the Hispaniola we were met by the new ship's mate, Mr. Arrow, a brown old sailor with earrings in his ears. He and the squire were very friendly, but I soon noticed that things were not the same between the squire and the captain. Captain Smollett seemed angry with everything on board and wasted no time in coming to the cabin to tell the squire.

## کاپتن سمۆلیت

کاتێك سەرکەوتینە سەر کەشتیەکە (هیسپانیۆلا) لەو کاتە چاومان کەوت بە نەفسەری کەشیەکە بەرێز (ئارەو) کە دەریاوانێکی بەتەمەنی پێست قاوەیی بوو، هەروەها گوارەی لە گوێیەکانی کردبوو. بەرێز ئارەو لەگەڵ ئاغا تریلۆنی زۆر هاورێ بوون، هەر زوو تێبینیم کرد کە شتەکانی نێوان تریلۆنی و کاپتنەکە هەمان شت نین. کاپتن سمۆلیت بە هەموو شتێکی سەر کەشتیەکە تورە بوو، هەروەها کاپتن سمۆلیت کاتی بەفیڕۆ نەدەدا بێت بۆناو کابینەی کەشتیەکە کە بە تریلۆنی بڵێت تورەیە.

'Sir, I don't like this voyage, I don't like the men and I don't like my officer. That's short and sweet', said the captain.

'Perhaps, sir, you don't like the ship?' asked the squire, who was clearly angry.

کاپتن سمۆلیت ووتی: گەورەم، من حەز لەم گەشتە دەریاییە ناکەم، حەز لە پیاوەکان (دەریاوانەکانی سەرکەشتیەکە) ناکەم، هەروەها حەز لە ئەفسەرەکەم ناکەم. ئەوە زۆر بەراشکاوی و ئاشکرا دەیڵێم.

تریلۆنی کە بە ئاشکرا تورە بوو پرسیاریکرد:" لەوانەیە بەرێز تۆ حەز بە کەشتیەکە نەکەیت؟

'That I can't say, since I haven't seen her tried', replied the captain. 'She seems a good ship, but I can't say any more'.

At this moment Dr. Livesey spoke.

'Wait a minute', he said. 'That isn't at all helpful. I'd like to hear an explanation of what the captain has said. You don't, you say, like this voyage. Now, why?

**کاپتن سمۆلێت وەڵامی دایەوەو ووتی:" ناتوانم ئەوە بڵێم چونکە تاقیکردنەوەکەیم نەبینیوە (واتە کەشتیەکەم نەبینیوە لە کاتی گەشتی دەریایی)،کەشتیەکە وادیارە کەشتیەکی باش بێت،بەڵام ناتوانم شتی زیاتر بڵێم".لەم کاتەدا دکتۆر لڤیسی قسەی کرد و ووتی:" یەك خولەك (چاوەڕێکە) ئەوە بە هیچ شێوەیەك یارمەتیدەر نیە، پێم خۆشە گوێ بیستی ڕوونکردنەوەیەکی ئەو قسانە بم کە کاپتن سمۆلێت گووتی،تۆ دەڵێی حەز بەم گەشتە دەریاییە ناکەیت.ئێستا بۆچی حەزناکەی لەم گەشتە؟**

'I took this job under what we call 'sealed orders', that is, I agreed to sail the ship without first knowing where we were going', said the captain. 'But now I find that all the crew know more than I do. Next', continued the captain, 'I hear, from my own crew, that we are going to find treasure. Treasure is dangerous, and I don't like treasure voyages, especially when they are secret'.

**کاپتن سمۆلێت ووتی:" من ئەم ئیشەم وەرگرتووە لەژێر ئەو فەرمانانەی کە شاراوەو نهێنین تاکو دواتر ئاشکرای دەکەن-ئەوەیە کە من ڕازی بوومە بەم گەشتە لەسەرەتاوە بەبێ ئەوەی بزانم بۆ کوێ ڕۆشتووین.بەڵام ئێستا دەزانم کە هەموو دەستە پیاوەکانی سەر کەشتیەکە زیاتر لە من دەزانن سەبارەت بەم گەشتە.کاپتن سمۆلێت بەردەوام بوو لە قسەکانی و ووتی:"دواتر،دەبیستم لە دەستە دەریاوانەکانی خۆم کە بۆ دۆزینەوەی**

گەنجینە دەڕۆین.گەنجینە ترسناکەو حەز بە گەشتە دەریاییەکانی دۆزینەوەی گەنجینە ناکەم، بەتایبەتی کاتێك ئەو گەشتە دەریاییانە نهێنین".

'I understand what you are saying, and I must say, it's true enough', replied Dr. Livesey. 'You say you don't like the crew. Are they not good sailors?'

'I don't like them, sir,', replied Captain Smollett. 'And I wasn't able to choose them myself'.

دکتۆر لیڤیس وەڵامی دایەوەو ووتی: "تێدەگەم چی دەڵێی ، پێویستە بڵێم ئەوە ڕاستە، تۆ دەڵێی حەز بە دەستە دەریاییەکانی سەرکەشتیەکە ناکەیت.ئایا ئەوان دەریاوانی باش نین؟

کاپتن سمۆڵیت وەڵامی دایەوەو ووتی: "گەورەم حەز بە دەریاوانەکانی سەر کەشتییەکە ناکەم، هەروەها ناتوانم خۆم هەڵیانبژێرم".

'And you don't like Mr. Arrow?' continued the doctor.

'I don't, sir, I believe he's a good sailor, but he's too friendly with the crew to be a good officer'.

دکتۆر لیڤیسی بەردەوام بوو لە پرسیارکردن و ووتی: " حەز بە بەڕێز (ئارەویش) ناکەیت؟ کاپتن سمۆڵیت وەڵامی دایەوەو ووتی: " بەڵێ حەز بە (ئارەو) ناکەم، بەڕێز ئارەو دەریاوانێکی باشە، بەلام لەگەڵ دەستە دەریاوانەکانی سەر کەشتیەکە زۆر دۆستانەیە بۆ ئەوەی ببێت بە ئەفسەری سەر کەشتیەکە".

'Well, Captain', said the doctor, 'then tell us what you want'.

'There are two things', said the captain. 'First, the gun powder and weapons should be put under the cabin near the stern of the ship, and not where they are now. And second,

the crew you have brought with you should sleep at the back near the cabin as well. And there has been too much talk already'.

دکتۆر لڤیسی ووتی: "زۆرباشه کاپتن، کەواتە پێمان بڵێ چیت دەوێ.
کاپتن سموڵیت ووتی: " دوو شت هەن: یەکەم، باروت و چەکەکان دەبێت لەژێر کابینەکە لە نزیک دواوەی کەشتیەکە دابنرێت و، لەوشوێنە نەبێت کە ئێستا دانراوە. دووەم شت، ئەو دەستە دەریاوانەی کە هێناوتە دەبێت لە دواوەی نزیک کابینەکە بخەون، هەروەها پێشتر زۆر قسەکردن هەبووە لێرە (واتە زۆر قسە دەکەن)".

'Far too much', agreed the doctor.
'It is said that you have a map of an island', said Captain Smollett, 'that there are crosses on it to show where the treasure is, that the island lies…' and then he gave the exact latitude and longitude.

دکتۆر لڤیسی ڕازیبوو و ووتی: " داواکارییەکانت زۆرن؟
کاپتن سموڵیت ووتی: "دەڵێن کە نەخشەی دوورگەیەکت هەیەو لەسەر نەخشەکە هێڵی لەسەرە بۆ پیشاندانی ئەو شوێنەی گەنجینەی تێدایەو دوورگەکەی لێیە…" پاشان ئەو نەخشەیە هێڵی پانی و درێژی شوێنی گەنجینەکانی لەسەر دیاریکراوە.

'I never told anyone that!' cried the squire.
'The crew know it', said the captain.
'Livesey, that must have been you or Hawkins', cried the squire.
'It doesn't matter who it was', replied the doctor.

تریلۆنی هاواریکرد و ووتی: "هەرگیز ئەوەم بە کەس نەگوتووە!".
کاپتن سموڵیت ووتی: " دەستە دەریاوانەکانی سەر کەشتیەکە بەمە دەزانن".

تریلۆنی هاواریکرد و ووتی:"لڤسی، دەبێت تۆ بی یان هۆکینس کە بـە دەریاوانـەکانت گوتووە".

دکتۆر لڤیسی وەڵامی دایەوەو ووتی:" کێشە نیە هەرکەسـێك بـوو بێـت ئـەم قـسانەی کردبێت".

'Well', continued the captain, 'I don't know who has this map, but it must be kept secret even from me and Mr. Arrow'.

'I see', said the doctor. 'you want us to keep this matter secret, and to make a garrison of the stern part of the ship, with my friend's own people, and provided with all the arms and powder on board. You fear a mutiny'.

کاپتن سمۆلێت بـەردەوام بـوو لـە قـسەکردن و ووتـی:" زۆرباشـە، نـازانم کـێ ئـەم نەخشەیەی پێیە، بەلام دەبێت نهێنی بێت تەنانەت لە من و بەرێز ئارۆویش".

دکتۆر لڤیسی ووتی:" تێدەگەم، تۆ دەتەوێ ئێمە ئەم کێـشەیە بـە نهێنـی بهێڵینـەوەو قەلایەك دروست بکەین لـە بەشـی دواوەی کەشـتیەکە لەگـەڵ ئـەو خەڵکـەی لەگـەڵ هاورێکەمدان، پاشان چەك و بارووت بە هەموویان بدەین لەسەر کەشتیەکە. تۆ (کـاپتن سمۆلێت) لە یاخی بوون دەترسی".

'I didn't say that', said Captain Smollett. 'I believe Mr. Arrow is an honest man, and some of the others, too. but it is my job to make sure that the ship, and every man on it, is safe. All I am asking you to do is to take every care, or let me leave the ship. And that's all'.

کاپتن سمۆلێت ووتی:" من وام نەگووت، من پێم وایە بـەرێز ئـارۆو لەگـەڵ هەنـدێکی تریان راستگۆن. بەلام ئەوە ئیشی منە دڵنیابم لەوەی کە کەشتیەکەو هەموو پیاوەکانی سەر کەشتیەکە سەلامەتن. هەموو ئەو شتانەی پرسیارت لێدەکەم ئەوەیە کە ئاگـاداری

هەموو شتێك بیت یان ڕێگەم بدە کەشتیەکە بەجێبهێڵم. ئــەوە هــەموو شــتێکە کــە مــن دەمەوێت".

The doctor and the squire agreed to Captain Smollett's suggestions, and then the captain left the cabin.

'Trelawney', the doctor then said, 'I am surprised, but you have managed to get two honest men on board with you; that man and John Silver'.

دکتۆر لڤیسی و تریلۆنی ڕازیبوون بە پێـشنیارەکانی کـاپتن سمۆلێـت، پاشـان کـاپتن سمۆلێت کابینەکەی بەجێهێشت.

ئینجا دکتۆر لڤیسی ووتی:" تریلۆنی، من سەرسامم، بەلاّم تۆ هەوڵـدا بـۆ هێنـانی دوو پیاوی ڕاستگۆ لەسەر کەشتیەکە لەگەڵ خۆت- ئەو پیاوەو جۆن سیلڤەر.

## Episode 4: The voyage

## The voyage begins

All night we were very busy getting the ship ready to sail. The sun was just coming up when everyone moved to their places, ready to leave the docks.

## زنجیرەی چوارەم: گەشتە دەریاییەکە

## گەشتە دەریاییەکە دەستپێدەکات

**بەدرێژایی شەو هەموومان مەشغوڵ بووین بە ئامادەکردنی کەشتیەکە بۆ گەشتی دەریایی. خۆر هەڵهات، کاتێك هەموو کەسێك بەرەو شوێنەکانیان ڕۆشتن و ئامادەبوون بۆ بەجێهێشتنی بەندەرەکانی بارکردن و هەڵگرتنی کەشتیەکان.**

'Sing us a song', shouted one of the crew to Long John.

'The old one', cried another sailor.

And Long John Silver, who was standing nearby, started to sing the song I knew so well:

**یەکێك لە دەریاوانەکان هاواریکرد بۆ لۆنگ جۆن و ووتی: " گۆرانیەکمان بۆ بڵێ".**

**دەریاوانێکی تر هاواریکرد و ووتی: " گۆرانیە کۆنەکە بڵێ".**

**لۆنگ جۆن سیلڤەر کە لە نزیکەوە وەستابوو، دەستیکرد بە ووتنی ئەو گۆرانیەی کە منیش دەمزانی:**

'Fifteen men on the dead man's chest-'

And then the whole crew sang:

'Yo-ho-ho, and a bottle of rum!'

***پانزە پیاو لەسەر سندوقی پیاوە مردووەکە-***

پاشان هەموو دەریاوانەکان گۆرانیەکەیان ووت؛
*یۆ-هۆ-هۆ، و بوتڵێکی ڕەم!"*

And at the last word! The sailors pushed the capstan-bars hard. It was an exciting moment, and the song carried me back to The Admiral Benbow in a second, and I seemed to hear the old captain singing too.

**لەکۆتا ووشەدا، دەریاوانەکان بە قورسییەوە خلخلۆکەی بەرزکردنەوەی لەنگەرەکەیان ڕاکێشا. کاتێکی خۆش بوو، هەروەها لەماوەی چرکەیەکدا گۆرانیەکە گەڕاندمییەوە بۆ خانەی ئەدمیراڵ بێنباو، هەروەها وادیار بوو گوێ بیستی گۆرانی کاپتنە بەتەمەنەکە (بیلْ) دەبووم.**

But soon the anchor was up and hanging at the bows. The sails started to fill with wind and before I could lie down for an hour's sleep, the Hispanoila had begun her voyage to the island of treasure.

**بەڵام هەرزوو لەنگەری کەشتیەکە بەرز کرایەوەو لە دەسکەکانی هەڵواسرا. چارۆکەکانی کەشتیەکە پڕ بوون لە هەوا، پێش ئەوەی بتوانم بۆ ماوەی کاتژمێرێك بخەوم، کەشتیەکە (هیسپانیۆلا) دەستیکرد بە گەشتەکەی بۆ دوورگەی گەنجینە.**

I am not going to tell you every detail of that voyage, the ship proved to be a good ship, the crew were experienced sailors and the captain certainly knew what he was doing. But by the time we arrived at Treasure Island, two or three things had happened which I should tell you about.

**هەموو ووردەكارییەكی ئەو گەشتە دەریاییەتان پێناڵێم-كەشتیەكە سەلماندی كە كەشتیەكی باشە،دەریاوانەكان دەریاوانی بە ئەزموون بوون و كاپتن سمۆلێت بەدڵنیاییەوە دەیزانی چی دەكات.بەلأم كاتێك گەیشتینە دوورگەی گەنجینە،دوو یان سێ شت ڕوویدا كە پێویستە پێتانی بڵێم.**

First, Mr. Arrow was worse than the captain had feared. He had no control over the crew and people did what they liked. Then after a day or two at sea, he began to act like a man who was drunk. Again and again he was sent below deck because he could not work properly. But no one knew where he could be getting the drink.

**یەكەم،بەڕێز ئارەو خراپتر بوو لەچاو ئەوەی سمۆلێت ترسا لە خراپی ئارەو.بەڕێز ئارەو كۆنترۆڵی نەبوو بەسەر دەریاوانەكان و خەڵكی سەر كەشتیەكە هەرچیەكیان ویست كردیان.ئینجا پاش دوو یا سێ ڕۆژ لە دەریاكە،بەڕێز ئارەو وەك وەكو پیاوێكی سەرخۆش هەڵسوكەوتی دەكرد.دووبارەو دووبارە بەڕێز ئارەو نێردرایەوە ژێر ڕووی كەشتییەكە چونكە نەیتدەتوانی بە ڕێكوپێكی ئیش بكات.**

No one was very surprised, or sad, therefore, when one dark, stormy night he disappeared and was not seen again. 'He must have fallen over the side of the ship', said the captain.

**بەلأم یەك كەس نەیزانی بەڕێز ئارەو لە كوێ توانیویەتی خواردنەوە بەدەست بهێنێت. یەك كەس سەرسام نەبوو یان خەمبار نەبوو،لەبەر ئەوە كاتێك شەوێكی تاریك و ڕەشەبا بەڕێز ئارەو دیارنەماو دووبارە نەبینرایەوە.كاپتن سمۆلێت ووتی:" دەبێت ئارەو كەوتبێتە سەر لایەكی كەشتیەكە".**

During the voyage I got to know Long John Silver and see him at work. Although he only had one leg, he moved about on board with amazing ease. The crew did what he told them to do and seemed to like him. He was friendly to everyone and was always glad to see me in the galley, which he kept very clean.

بەدرێژایی گەشتەکە لۆنگ جۆن سیلڤەرم باش ناسی و لە ئیشکردندا بینیم.هەرچەندە لۆنگ جۆن یەك قاچی هەبوو، بەڵام لەسەر کەشتیەکە بە ئاسانییەکی سەرسوڕمانەوە دەجوڵا ( دەڕۆشت ).لۆنگ جۆن چی بە دەریاوانەکانی گووت، ئەوانیش ئە نجامیانداو وادیار بوو دەریاوانەکان حەزیان بە لۆنگ جۆن دەکرد.لۆنگ جۆن لەگەڵ هەموو کەسێك دۆستانە بوو، هەروەها هەمیشە دڵخۆش بوو بە بینینم لە مەتبەخەکەدا کە زۆر پاکو خاوێنی مەتبەخەکەی ڕادەگرت.

'Hawkins, come and have a chat with John' he used to say. 'Here's Captain Flint, named after the famous pirate', and he pointed to the parrot he kept in a cage in the corner of the galley. And the parrot used to say, again and again, 'Pieces of eight! Pieces of eight!' until John threw a cloth over the cage.

لۆنگ جۆن ڕاهاتبوو بە ووتنی:" هۆکینس، وەرە لەگەڵ جۆن قسە بکە ( واتە لەگەڵ لۆنگ جۆی سیلڤەر )، کاپتن فلنت هەبوو کە لەدوای چەتەیەکی بەناوبانگی دەریایی ناونراوە؛ ئینجا جۆن ئاماژەی کرد بۆ بەبەغاکە کە لەناو قەفەسێك داینابوو لە سوچێکی مەتبەخەکە.هەروەها بەبەغاکە دووبارەو دووبارە ڕاهاتبوو بە ووتنی:" پارە ووردە ئاڵتوونیەکان!"، " پارە ووردە ئاڵتوونیەکان! تاکو لۆنگ جۆن پەڕۆیەکی هەڵدایە سەر قەفەسەکە.

'It's been everywhere, that old parrot. It says 'Pieces of eight' because it was there when the ships were pulled up from the seabed with three hundred and fifty thousand of those coins on board', explained the cook.

**چێشتلێنەرەکە ڕوونیکردەوەو ووتی؛"ئەو بەبەغا بەتەمەنە لە هەموو شوێنێک هەبووە.بەبەغاکە دەڵێت؛ "پارە ووردە ئاڵتوونیەکان" چونکە بەبەغاکە لەو شوێنە بووە کاتێک کەشتییەکان لە بەندەرەکان جیابوونەوەو سێ سەد و پەنجا هەزار (٣٥٠٠٠٠) پارەی ووردەی ئاڵتوونی لەسەر کەشتیەکە بوو".**

## What I heard in the apple barrel

Before we arrived at Treasure Island, something happened that dramatically changed what I thought of Long John Silver. On the deck of the ship was a barrel of apples. One evening, when I had finished work, I went up on deck to get an apple.

## لەناو بەرمیلی سێوەکەچیم بیست

پێش ئەوەی بگەین بە دوورگەی گەنجینە،شتێك ڕوویدا کە لەڕووی درامایەوە ئەوەی من لە لۆنگ جۆن تێگەیشت بووم گۆڕای.لەسەر ڕووی کەشتییەکە بەرمیلێکی سێو هەبوو.ئێوارانێك کاتێك ئیشەکەم تەواو کرد،ڕۆشتمە سەر ڕووی کەشتییەکە بۆ ئەوەی سێوێك بەدەستبهێنم ( بیخۆم ).

I climbed into the barrel and found that there were hardly any apples left. But sitting down there in the dark, with the gentle movement of the ship, I must have fallen asleep. Suddenly I woke up as someone sat down heavily against the barrel. Then the man began to speak. It was Silver's voice. Frightened, I sat and listened.

خۆم هەڵدایە ناو بەرمیلەکەو پاشان بەدەگمەن چەند سێوێکی تیابوو،بەڵام لەناو بەرمیلەکە دانیشتم لەو تاریکییە،لەگەڵ جوولە نەرمەکەی کەشتیەکە،خەوم لێکەوت.لەناکاوە بەخەبەر هاتم کاتێك کەسێك بە قورسیەوە دانیشت لە پاڵ بەرمیلەکە.ئینجا پیاوەکە دەستیکرد بە قسەکردن،قسەکان دەنگی لۆنگ جۆن سیلڤەر بوو.ترسام و دانیشتم و گوێم کرد.

'No. Flint was the captain, not I', said Silver. 'I looked after the supplies. I lost my leg at the same time that Pew lost his eyes. But later on I saw Flint's ship so heavy with gold I thought that it would sink'.

**سیلڤەر ووتی:" نەخێر فلنت کاپتن بوو،من کاپتن نەبووم".من چاودێری خواردنەکانم دەکرد.قاچم لەدەستدا لە هەمان کاتدا کاتێك ( پیو ) چاوەکانی لەدەستدا.بەڵام دواتر کەشتییەکەی فلنتم بینی بە ئاڵتوونەوە کە زۆر قورس بوو، پێم وابوو کەشتییەکە نوقم بوو.**

'Ah!' said another voice, the voice of Dick, the youngest man on board, 'He was the best of them all, was Flint!'

**دەنگی کەسێکی تر هات کە دیك بوو و هەروەها گەنجترین پیاوی سەر کەشتیەکە بوو ووتی:"ئاە،فلنت باشترینی دەریاوانەکانی بوو!".**

'Well, I got two thousand from Flint. That's not bad for a simple sailor, is it? I put it all safe in the bank. It's all about saving. But where are Flint's men now? Most of them are on board this ship, and they're glad to earn a bit of money', said Silver.

**سیلڤەر ووتی:" زۆرباشە،دوو هەزارم لە فلنت وەرگرت،ئەوەش خراپ نیە بۆ دەریاوانێکی سادە،وایە؟هەموو ئەو برە پارەیەشم بە سەلامەتی لە بانك داناوە،هەموو پارەکە سەلامەتە،بەڵام ئێستاکە پیاوەکانی فلنت لە کوێن؟زۆربەیان لەسەر ڕووی ئەم کەشتیەن و خۆشحاڵن بۆ دەستکەوتنی پارەیەکی کەم.**

'You see, I save my money, whereas those other gentlemen of fortune spend it on rum and a good time. Then they have to go to sea again, when they have nothing left but their

shirts. But I'm fifty now, and when I finish this voyage, I'll be able to live somewhere for the rest of my life.

**دەبینیت، پارەکەم پاشەکەوت دەکەم، لەکاتێکدا ئەو پیاوە خانەدانانەی تر پارەکەیان بە خواردنەوەی رەم و ڕابواردن سەرف دەکەن. ئینجا دەبێت دووبارە بگەڕێنەوە بۆ دەریا، کاتێك هیچیان نەماوە جگە لەو جلانەی دەیپۆشن. بەڵام ئێستاکە من پەنجا ساڵ تەمەنمەو کاتێك ئەم گەشتە دەریاییە تەواو دەکەم، دەتوانم لە شوێنێك بژیم لە باقی تەمەنی ژیانمدا.**

'But you can't go back to Bristol after this', said the other voice. 'Right, and my wife is getting my money now. She's selling The Spy-glass and she'll meet me somewhere away from Bristol when I'm finished', explained Long John.

**کەسێکی تر ووتی: "بەڵام ناتوانی لە پاش ئەم گەشتە بگەڕێیتەوە بۆ بریستۆڵ". سیلڤەر ووتی: "ڕاستە، خێزانەکەم ئێستا هەموو پارەکەم وەردەگرێت، خێزانەکەم خانەی سپای گلاس (تەلیسکۆپ) دەفرۆشێت و لە شوێنێکی دوور لە بریستۆڵ چاوی پێمدەکەوێت کاتێك لەم گەشتە دەریاییە تەواو دەبم".**

'I like my job much better now I've talked with you', said the young man.

'You're a brave boy, and clever too', answered Silver. 'And I've never seen a better gentleman of fortune'.

**پیاوە گەنجەکە (دیك) ووتی: "ئێستاکە باشتر حەزم لە پیشەکەمە کە قسەم لەگەڵ کردی". جۆن سیلڤەر ووتی: "تۆ کوڕێکی ئازاو زیرەکی، هەروەها هەرگیز پیاوی خانەدانی باشترم نەبینیوە بەدوای دەوڵەمەند بوون بگەڕێت وەك تۆ.**

By this time I had begun to understand that when Silver said 'gentlemen of fortune' he meant pirates, and I knew that he had just corrupted one of the honest men on the ship.

**لەم کاتەدا تێگەیشتم کە کاتێك جۆن سیلڤەر ووتی: "پیاوی خانەدانی شوێنکەوتووی سەروەت و سامان" مەبەستی چەتەی دەریاییە، وەهەروەها زانیم کە جۆن یەکێکی لە پیاوە ڕاستگۆکان گەندەڵ کردووە لەسەر کەشتیەکە.**

A few minutes later, Silver called another man over to the barrel.

'Dick's with us', said Silver.

'Oh, I knew he would be', replied the voice of the coxswain, Israel Hands.

**پاش چەند خولەکێك سیلڤەر بانگی پیاوێکی تری کرد و ووتی: "دیکمان لەگەڵە". دەنگی نەفسەرە پلە نزمەکە هات کە ئیزرەیل هاندس بوو وەڵامی دایەوەو ووتی: "ئۆه، دەزانم دیك لەگەڵتانە".**

'Now', started Long John Silver, 'Captain Smollett is an excellent sailor, and the doctor and the squire have the map somewhere secret, which means I don't know where it is, do I? So I say that we wait until they've found the treasure, and they have helped us to get it on board'.

**جۆن سیلڤەر دەستپێکرد و ووتی: "ئێستا، کاپتن سمۆلیت دەریاوانێکی زۆرباشەو دکتۆر لڤیسی و ترێلۆنی نەخشەکەیان پێیەو لە شوێنێکی نهێنیە کە مانای وایە نازانم نەخشەکە لە کوێیە، ئایا دەزانم؟ کەواتە دەڵێم چاوەڕێ دەکەین تاکو لڤیسی و ترێلۆنی خەزێنەکە دەدۆزنەوەو یارمەتیمان دەدەن گەنجینەکە بخەینە سەر کەشتیەکە".**

'But we're all sailors on board this ship!' cried Israel. 'we don't need Smollett and the others'.

**ئیزرەیل هاواریکردو ووتی: "بەلام ئێمە هەموومان دەریاوانین لەسەر ڕووی ئەم کەشتیە! پێویستمان بە سمۆلێت و ئەوانی تر نیە".**

'we can sail the ship', said Silver angrily. 'But who would know which direction to go? Listen I know the type of man you are. You are never happy until you're drunk, and then you make mistakes. But I know how to do this and, believe me, if we do it too quickly, then we'll hang'.

**سیلڤەر بە توڕەییەوە ووتی: "دەتوانین کەشتیەکە بەڕێوە ببەین لە گەشتەکەی، بەلام کێ دەزانێت بە چ ئاڕاستەیەك بڕۆین؟ گوێبگرن، دەزانم چۆن پیاوێکی، تۆ (ئیزرەیل) هەرگیز دلخۆش نابیت تاکو سەرخۆش نەبیت و ئینجا هەڵە دەکەیت. بەلام من دەزانم چۆن ئەم کارە ئەنجام بدەم، بڕوام پێبکە ئەگەر ئەم کارە بکەین زۆر بەخێرایی ئەوە لە سێدارە دەدرێین.**

'All right, but when we do get them, what will we do to them?' asked Dick.

'We can leave them on the island or we can kill them, that's what Flint or Billy Bones would have done', said Silver. 'Now let's have some rum!'

**دیك پرسیاری کردو ووتی: " زۆرباشە، بەلام کاتێك گە نجینەکا نمان دەستکەوت چی بەو دەریاوانانە بکەین؟**
**سیلڤەریش ووتی: " یان لە دوورگەکە بەجێیان دەهێڵین یان دەتوانین بیانکوژین- ئەوە ئەو شتەیە کە فلنت یان بیلی بەونز کردوویانە".**

سیلڤەر ووتی:" من دەڵێم پێویستە بیانکوژین.چاوەڕێ دەبین،و ئینجا ئەم کارە دەکەین.ئێستا با هەندێك ڕەم بخۆینەوە".

'Dick', said Silver, I'll let you get it. Here's the key. Fill up a cup and bring it up'. I realized that this must have been how Mr. Arrow had got the drink that killed him.

سیلڤەر ووتی:"دیك، بڕۆ ڕەمەکان بهێنە،ئەوە کلیلەکەیە.کوپێك پڕبکەو بیهێنە".
تێگەیشتم کە ئەمە دەبێت ئەوە بێت کە چۆن بەڕێز ئارەو خواردنەوەی ڕەمەکەی بەدەستهێناوەو کوشتوویەتی.

While Dick was gone, I heard Israel speaking quietly to Silver. I heard him say, 'not another man of them will join us'. So I thought there must still be honest men on board.

Moments later the moon started to shine down on me in the barrel, and almost at the same time a voice shouted, 'Land ho!'

کاتێك دیك ڕۆیشت،گوێم لە ئیزرەیل بوو بە هێمنی قسەی بۆ سیلڤەر دەکرد.بیستم کە ئیزرەیل دەڵێ:نابێت پیاوی تر لەو دەریاوانانە پەیوەندیمان پێوە بکات".کەواتە پێم وابوو کە دەبێت پیاوی ڕاستگۆی تر هەبێت لەسەر ڕووی کەشتییەکە.
پاش چەند خولەکێك ڕووناکی مانگەکە دەرکەوت و بەرمکەوت لەناو بەرمیلەکە،هەر لەوکاتە کەسێك هاواریکرد:"ووشکانی".

## I share the bad news

Men came running onto the deck, and I jumped quickly out of the barrel without being seen and joined them at the bow. To the south-west were the three hills of Treasure Island. I heard Silver tell Smollett that he had stopped in a bay here years before to get supplies and water.

## هەواڵە خراپەکە بڵاو دەکەمەوە

دەریاوانەکان بەڕاکردن هاتن بۆ سەر ڕووی کەشتیەکەو منیش لە بەرمیلەکە خۆم هەڵدایە دەرەوە بەبێ ئەوەی کەس بمبینێت و پەیوەندیم کرد بە دەریاوانەکان لەلای دەسکی لەنگەرەکانی کەشتیەکە.بەرەو ناڕاستەی ڕۆژئاوای باشور سێ گردی دوورگەی گەنجینە هەبوو.بیستم سیلڤەر بە کاپتن سمۆلێت دەڵێت کە چەند ساڵێك پێش ئێستا لە کەنداوەکەی ئێرە وەستاوە بۆ هێنانی خواردن و ئاو.

'Look at this map', said Smollett, 'and show me the place'.

'Long John's eyes burned in his head as he took the map.

کاپتن سمۆلێت ووتی:"سەیری ئەم نەخشەیە بکەن و شوێنەکەم پیشان بدەن".
لۆنگ جۆن چاوی ڕۆشتە پشت سەری هەرکە نەخشەکەی وەرگرت.

However the map was not the map we had found in Billy Bones' chest. It was a new copy, complete in every detail apart from the red crosses and the written notes. Silver must have been disappointed, but he managed to hide it well.

هەرچۆنێك بێت،نەخشەکە ئەو نەخشەیە نەبوو کە ئێمە لە سندوقەکەی بیلی بەونز دۆزیمانەوە،بەڵکۆ کۆپیەکی نوێی نەخشەکە بوو کە تەواوی هەموو ووردەکارییەکی

تێدابوو بێجگە لە هێڵی پەڕینەوە سورەکان و تێبینیە نوسراوەکان.سیلڤەر دەبێت بێئومێد بوو بێت،بەڵام سیلڤەر هەوڵیدا بۆ شاردنەوەی نەخشەکە بەباشی.

A few moments later, when I was close enough to Dr. Livesey, I quite told him that I urgently needed to speak to him, the squire and the captain in the cabin.

پاش چەند خولەکێکی کەم،کاتێك لە دکتۆر لڤیسی نزیك بووم،بە هێمنییەوە بە دکتۆر لڤیسیم گووت کە پێویستە قسە لەگەڵ لڤیسی و تریلۆنی و کاپتن سمۆڵێت بکەم لەناو کابینەی کەشتیەکە.

I explained everything I had heard. All three of them thanked me for my luck and for being brave.

'Captain', said the squire, 'you were right, and I was wrong. He now realized the terrible mistakes he had made. 'I am stupid', he went on, 'and I put myself under your orders'.

هەموو ئەو شتانەم ڕوونکردەوە کە بیستم.هەرسیانیان (لڤیسی و تریلۆنی و کاپتن) سوپاسیان کردم بۆ ئەو بەخت و نازایەتیەی کە هەمبوو.

تریلۆنی ووتی:"کاپتن،تۆ ڕاست بوویت و من هەڵە بووم".

تریلۆنی ئێستا دەرکی بەو هەڵە ترسناکانە کرد کە کردبووی.تریلۆنی ووتی:" من گەمژەم" پاشان تریلۆنی بەردەوام بوو لە قسەکردن و بە کاپتنی ووت:"من ملکەچی فەرمانەکانت دەبم".

'First', began the captain, 'we must go on, because we can't turn back. If I told them to turn back they would attack us immediately. Secondly we have time, at least, before we find the treasure. Thirdly, there are honest men.

کاپتن دەستیپێکرد و ووتی: "یەکەمجار دەبێت بەردەوام بین لەم گەشتە چونکە ناتوانین بگەڕێینەوە. ئەگەر بەوانم بگووتایە بگەڕێینەوە، ئەوە ڕاستەوخۆ هێرشیان دەکردە سەرمان. دووەم، کاتمان لەبەر دەستەو بەلایەنی کەمەوە پێش ئەوەی گەنجینەکە بدۆزینەوە. سێیەم، پیاوی (دەریاوانی تری سەر کەشتیەکە) ڕاستگۆ هەیە.

Now, sir, there will be a fight sooner or later, and so I think we should attack them when they least expect it. Can we be sure that the men you brought with you from home are honest, Mr. Trelawney?'

ئێستاکە گەورەم زوو بێت یان درەنگ شەڕ ڕوو دەدات، کەواتە پێم وایە هێرش بکەینە سەریان کاتێك ئەوان کەمترین پێشبینی ئەم شەڕەیان کرد. بەڕێز تریلۆنی، ئایا دەتوانین دڵنیا بین کە ئەو پیاوانەی لەگەڵ خۆت هێناوتە ڕاستگۆ بن؟

'Yes, as honest as myself', replied the squire.

'So that's three men', said the captain, 'and we make seven. Now, which of the other men do you think are honest?'

'Probably the men that Trelawney found before he met Silver', said the doctor.

تریلۆنی وەڵامی دایەوە: "بەڵێ وەکو خۆم ڕاستگۆن".

کاپتنیش ووتی: "کەواتە ئەوە سێ پیاون و دەبین بە حەوت کەس. ئێستاش کام دەریاوانی تر لەو پیاوانە پێت وایە ڕاستگۆن؟

دکتۆر لڤیسی ووتی: "لەوانەیە ئەو پیاوانە ڕاستگۆ بن کە تریلۆنی دۆزیبانیەوە پێش ئەوەی چاوی بە سیلڤەر بکەوێت".

'But perhaps not, said the squire, 'Israel was one of mine, but he is with Silver'.

'Well', said Smollett, 'we must keep quiet and watch them all. We shouldn't do anything until we know our men'.

'Jim here', said the doctor, 'can help us more than anyone. The men like him and he's good at noticing things'.

**تریلۆنی ووتی: "بەلام لەوانەیە ڕاستگۆ نەبن، ئیزرەیل هاندس یەکێك بوو لە پیاوەکانم، بەلام لەگەڵ سیلڤەرە ئێستا".**
**کاپتن سموّلیت ووتی: "زۆرباشە، دەبێت بێدەنگ بین و چاودێری ئەوان بکەین، نابێت هیچ شتێك بکەین تاکو پیاودکانی خۆمان دەناسین".**
**دکتۆر لڤیسی ووتی: "جیم لێرە دەتوانێت لە هەموو کەس زیاتر یارمەتیمان بدات. دەریاوانەکان حەزیان لە جیم هۆکنسە (واتە خۆشیان دەوێت) و جیم هۆکنسیش باشە لە تێبینی کردنی شتەکان".**

I began to feel very worried, since I didn't feel that I could help very much. In the end it was because of me that we were saved. However, at that moment our situation looked very bad. There were only seven out of the twenty six on board who we know honest. And of these seven, one was only a boy.

**هەستم بە پەرۆشییەکی زۆر کرد چونکە هەستم نەکرد بتوانم زۆر یارمەتی پێشکەش بکەم. لە کۆتاییدا بەهۆی منەوە بوو کە ڕزگارمان بوو. هەرچۆنێك بێت، لەوکاتەدا بارودۆخەکەمان زۆر خراپ دیار بوو، تەنها حەوت کەس هەبوو لە کۆی بیست و شەش دەریاوانی سەر کەشتیەکە کە دەمانزانی ڕاستگۆن. هەروەها لەم حەوت کەسە ڕاستگۆیە تەنها یەك کەسی کوڕێکی گەنج بوو.**

## Episode 5: We arrived at the island
## How my adventure on shore began

The island looked very different when I came on the deck the next morning. We had made good time in the night, and the ship was lying approximately half a mile to the south east of the island.

## زنجیرەی پێنجەم: گەیشتینە دوورگەکە
## چۆن سەرکەشییەکەم لە کەنار دەریا دەستی پێکرد

دوورگەکە زۆر جیاواز دەرکەوت کاتێك ڕۆژی دواتر هاتمە سەر ڕووی کەشتیەکە. لە شەودا بەخێرایی ڕۆشتین بەڕێوە، کەشتیەکەش نزیکەی نیو میلی بڕی بەرەو ڕۆژهەلاتی باشوری دوورگەکە.

Grey coloured woods covered a large part of the surface, and rocky hills pushed up high above these trees. The Spy-glass was the tallest hill on the island by more than three or four hundred feet, and it had a large flat top. I did not like the look of Treasure Island.

دارە ڕەنگ ڕەساسیەکان بەشێکی فراوانی ڕووی ناوچەکەیان دا پۆشیبوو، هەروەها گردە بەردینەکان (بەرِ) کەتبوونە لا بەرزەکانی ئەم دارانەوە. سپای گلاس (تەلیسکۆپ) بەرزترین گرد بوو لە دوورگەکە کە زیاتر لە سێسەد یان چوارسەد پێ بەرز دەبوو، هەروەها گردی سپای گلاس لوتکەیەکی فراوان و تەختی هەبوو. حەزم بە دیمەنی دوورگەی گەنجینەکە نەدەکرد.

With some difficulty we brought the ship into a safe but narrow passage of water between Treasure Island and the

nearby Skeleton Island, and we dropped the anchor. The trees came down to the shore, and there was a swamp with two little fresh water rivers running out into it. The air smelt of dead wet leaves.

بە هەندێ نارەحەتیەوە کەشتیەکەمان هێنا بۆ ڕاڕەوێکی سەلامەت بەڵام ڕاڕەوێکی باریکی ناو بوو لەنێوان دوورگەی گەنجینەو نزیك دوورگەی ئێسکەپەیکەر، پاشان لەنگەری کەشتیەکەمان خستەناو ئاوەکەوە (کەشتیەکەمان لەنگەری گرت).دارەکان شۆڕ بوو بوونە کەنار دەریاکەو،زەلکاوێك هەبوو لەگەڵ دوو ڕوبار ئاوی کەمێك سازگار کە دەڕژایە ناو زەلکاوەکە.هەوای ناوچەکە بۆنی مردوو و گەڵای تەڕی لێدەهات.

As soon as we arrived at the island most of the crew lay around on the deck grumbling together. Orders were followed slowly and carelessly, and mutiny it was clear, was hanging over us like a big black cloud.

هەرکە گەیشتینە دوورگەکە،زۆربەی دەریاوانەکان لەسەر ڕووی کەشتیەکە پاڵکەوتن و پێکەوە بۆڵەبۆڵیان کرد.فەرمانەکان بە کەمتەرخەمی و هێواشی جێبەجێ دەکران و،یاخیبونیش ئاشکرابوو وەك هەورێکی ڕەشی گەورە بەسەرمانەوە بوو.

We decided to have a meeting in the cabin.

'sir', said the captain, 'things are becoming very difficult and there's only one man who can help us'.

'And who's that? Asked the squire.

بڕیارماندابوو لەناو کابینەی کەشتیەکە کۆبوونەوەیەك بکەین.

کاپتن سمۆڵیت ووتی:"گەورەم شتەکان زۆر سەخت بوون و تەنها یەك کەس هەیە بتوانێت یارمەتیمان بدات".

**تریلۆنیش پرسیاریکرد و ووتی:" ئەو کەسە کێیە؟**

'Silver, sir', replied the captain. 'He's as worried as us and he is trying to hide what's happening. As soon as he can, he will talk to his men and tell them to work hard and keep quiet. Let's give the men an afternoon in the island. Provided that most of them go ashore with Silver, you'll see, he will bring them back as quietly as sheep'.

**کاپتن سمۆلێت وەلامی دایەوەو ووتی:"گەورەم ئەو کەسە سیلڤەرە،سیلڤەر وەکو ئێمە پەرۆشەو هەوڵدەدا بۆ شاردنەوەی ئەو شتانەی ڕوو دەدەن.هەرکە سیلڤەر بتوانێت،لەگەڵ پیاوەکانی قسە دەکات و پێیان دەڵێت بەباشی ئیش بکەن و بێدەنگیش بن سەبارەت بەم مەسەلەیە.با دەرفەتێك بدەین بە دەریاوانەکان ئەم ئێوارەیەو زۆربەیان بڕۆن بۆ کەنار دەریاکە لەگەڵ سیلڤەر-دواتر دەبینی-سیلڤەر هەموویان بەبێدەنگی وەك مەڕ دەگەڕێنێتەوە".**

And so it was decided. The squire, the doctor, the captain, myself, three other good men and about a third of the crew were going to stay on board the Hispaniola. Meanwhile, the other thirteen men, including Silver excitedly started to climb into the small boats.

**پاشان بڕیاردارو تریلۆنی و دکتۆر لڤیسی و کاپتن سمۆلێت و خۆم و سێ پیاوی تری باش و سێیەکی دەریاوانەکان لەسەر ڕووی کەشتیەکە مانەوە.لەهەمان کاتدا،سیانزە پیاوەکەی (دەریاوانەکەی) تر بە سیلڤەریشەوە بەخۆشحاڵیەوە دەستیان کرد بە دابەزین بۆ ناو بەلەمە بچوکەکان.**

It was then that I had the first of the mad ideas that helped so much to save our lives. With so few men on board, I was not needed on the ship. In a second I had climbed over the

side and quietly dropped down into the bottom of the nearest boat.

ئینجا ئەوەبوو کە یەکێك لە بیرۆکە شێتەکانم(سەرکەشییەکانم ) هەبوو کە زۆر یارمەتیداین بۆ ڕزگارکردنی ژیانمان.لەگەڵ چەند پیاوێکی کەمی سەر ڕووی کەشتیەکە،من پێویست نەبووم لەسەر کەشتیەکە (واتە ئیشیان بە من نەبوو لەسەر کەشتیەکە ).لەماوەی چرکەیەکدا خۆم هەڵدایە سەر لایەکی کەشتیەکەو بە هێمنییەوە خۆم هەڵدایە ناو بنی نزیکترین بەلەمەوە.

I thought no one had seen me. However, Silver who was in the other boat called out to know if it was me. I said that it was, and I wondered whether perhaps I should have stayed on board the ship.

.پێم وابوو کەس نەمیبینیبوو.هەرچۆنێك بێت سیلڤەر کە لەناو بەلەمەکەی تر بوو هاواریکرد بۆلای بەلەمەکەی ئێمە بۆ ئەوەی بزانێت کە ئایا ئەوە من بووم خۆم هەڵدایە ناو بەلەمەکە.ووتم ئەوە من بووم،هەروەها ویستم بزانم کە دەبوایە لەسەر ڕووی کەشتیەکە بوومایە (واتە لەسەر کەشتیەکە بمێنمەوەو نەهاتمایە بۆ ناو بەلەمەکە ).

When our boat reached the beach, I jumped out and ran into the trees. Not longer after that, I heard Silver shouting after me, ‘Jim, Jim!’ but I didn’t stop. I ran and until I could run no more.

کاتێك بەلەمەکەمان گەیشتە کەنار دەریاکە،بازمدایە دەرەوەو ڕامکرد بۆ ناو دارەکان. پاش ئەوە ئەوەندەی نەخایاند،بیستم کە لۆنگ جۆن سیلڤەر لەدواوە بانگم دەکات،"جیم،جیم!" بەڵام نەوەستام.ڕامکردو ڕامکرد تاکو نەمتوانی لەوە زیاتر ڕابکەم.

## The first shot

I was happy that I had avoided Silver, and I began to relax. Then, after I had continued walking through the woods for some time, I suddenly heard voices. The voices grew louder and nearer, and I hid behind a tree.

## یەکەم فیشەك تەقاندن

دڵخۆش بووم کە لە لۆنگ جۆن سیلڤەر دوور کەوتوومەتەوە، پاشان دەستمکرد بە پشوودان. ئینجا پاش ئەوە، بەردەوام بووم لە ڕێکردن بەناو دارەکان بۆ ماوەیەك، لەناکاوە گوێم لە دەنگە دەنگێك بوو. دەنگەکان بەرزتر و نزیکتر بوون، منیش لە پشت دارێکەوە خۆم حەشاردابوو.

I thought I should try to listen to the conversation, so I quietly moved closer through the trees. At last, I looked down a little hill towards an open area of swamp, and I saw Silver and one of the crew.

بیرمکردەوە کە دەبێت هەوڵبدەم گوێ لە گفتوگۆکە بگرم، پاشان بە هێواشی بەناو دارەکان نزیکتر بوومەوە. لە کۆتاییدا تەماشای گردە بچوکەکەم کرد کە بەرامبەر ناوچەیەکی کراوەی زەلکاو بوو، لۆنگ جۆن سیلڤەر و یەکێ لە دەریاوانەکانم بینی.

'Mate', Silver was saying, 'it's because I like you. If I hadn't liked you from the start, do you think I'd be warning you now? It's all finished and you can't do anything to change things. I'm trying to save you, join with us, Tom'.

سیلڤەر ووتی: " هاوڕێ، ئەمە لەبەر ئەوەیە حەزم بە تۆیە. ئەگەر لەسەرەتاوە حەزم بە تۆ نەبوایە، ئەوە پێت وایە ئێستا ئاگادارت دەکەمەوە؟ هەموو شتێك تەواو بوو، تۆش ناتوانیت هیچ بکەیت بۆ گۆڕینی شتەکان. من هەوڵدەدەم بۆ ڕزگارکردنی تۆ- پەیوەندیمان پێوە بکە، تۆم".

'Silver', said the other man, 'you're old and you're honest, and you've got money too, and you're brave. And you're telling me to join those men? Not you! I'd prefer to lose my hand than turn against my duty'.

پیاوەکەی تریش (تۆم) ووتی: " سیلڤەر تۆ بەتەمەنی و ڕاستگۆیت، هەورەها پارەت هەیەو زیرەکی. هەروەها پێم دەڵێی پەیوەندی بەو پیاوانەوە بکەم؟ ئەك تۆ! پێم باشە دەستم لەدەست بدەم لەچاو ئەوەی دژی ئەرکەکەم بوەستم".

Suddenly, from far away there was a loud cry of anger, then a horrible long scream. It was a death cry, and the sound of it would not leave my head.

لەناکاوە، لە دوورەوە هاوارکردنێکی بەرزی تووڕەیی هەبوو، ئینجا قیژاندنێکی ترسناکی بەرز هەبوو. ئەو قیژاندنە هاواری مردن بوو، هەروەها دەنگی هاوارەکە لە مێشکم دەرناچێت.

'what was that? Said Tom, shaking with fear.
'Oh', Silver quietly smiling, 'that must have been Alan'.
'Alan!' cried Tom. 'God rest his soul! He was a true seaman. You've killed Alan, have you? Kill me if you can'.

تۆم بە ترسەوە لەرزی و ووتی: "ئەوە چی بوو؟
سیلڤەر بە هێمنی خەندەیەکی بۆ کرد و ووتی: "ئۆه، دەبێت ئەوە ئالان بێت".

تۆم هاواریکرد: "ئالان، خوا ڕەحم بە ڕووحەکەی بکات! ئالان دەریاوانێکی ڕاستگۆ بوو. تۆ ئالانت کوشت، تۆ بووی؟ منیش بکوژە ئەگەر دەتوانیت".

And with that this brave man turned and walked away. With a cry, Silver threw his crutch with all his strength. It hit Tom in the middle of his back. He fell down, and in a moment, Silver had jumped on top of him and had killed him with a knife.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم پیاوە ئازایە ڕووی وەرگێڕاو ڕۆشت. سیلڤەریش بە هاوارێکەوە دارشەقەکەی بە هەموو هێزێکەوە هاویشت بۆ تۆم. دارشەقەکە بە توندی دای لە ناوەڕاستی پشتی تۆم. پاشان تۆم کەوتە سەر زەوی و لەوکاتەدا سیلڤەر خۆی هەڵدایە سەر تۆم و بە چەقۆیەك کوشتی.

Then I saw Silver slowly cleaning the blood from his knife on some grass. He took out a whistle and blew on it several times. I didn't know what this meant, but guessed that more men would be coming.

پاشان سیلڤەرم بینی بەهێواشی خوێنی سەر چەقۆکەی پاککردەوە بە هەندێ گیا. پاشان سیلڤەر شاوێکی (فیکە-سافیرە) دەرهێناو چەند جارێك فیکەی لێدا. نەمزانی ئەم فیکەیە مانای چییە، بەڵام پێشبینم کرد کە پیاوی زیاتر دێن.

I began to move away as quickly and quietly as I could. They had already killed two people. Might I be next? I ran and ran, full of fear. How could I go back to the boats with these men after what they had done? Would they kill me as soon as they saw me? It was a disaster, I thought. There was nothing left for me but death by one of the mutineers, or by starvation.

تا توانیم بەهێمنی و بەخێرایی دەستمکرد بە بەجێهێشتنی شوێنەکە.ئەو دەریاوانانە پێشتر دوو پیاویان کوشتبوو.لەوانەیە من سێیەم کەس بم بمکوژن؟ پڕ بە ترسەوە ڕامکردو ڕامکرد.چۆن بتوانم لەگەڵ ئەم دەریاوانانە بگەڕێمەوە بۆ لای بەلەمەکان پاش ئەو هەموو شتانەی کردوویانە؟ئایا دەمکوژن هەرکە منیان بینی؟پێم وابوو ئەوە کاردسات بوو.هیچ شتێکم بۆ نەمابوو جگە لە مردن نەبێت بە دەستی یەکێك لەم یاخیبوانەوە یان بەهۆی برسێتییەوە.

## The man of the island

Something had jumped with great speed behind a tree. It could have been a bear, or a man or a monkey: I could not tell. I was very frightened, and I couldn't move. Then I saw it again, running on two legs. It was dark and strange and bent over, but I knew that it was a man.

### پیاوی دوورگەکە

لە پشت دارێکەوە شتێك بەخێراییەکی مەزنەوە بازیدا. دەبێت ئەو شتە وورچ بوو بێت یان پیاوێك یان مەیمون؛ نەمتوانی بڵێم چیە. زۆر ترسام و نەمتوانی بجوڵێم. ئینجا دووبارە ئەو شتەم بینیەوە کە بەسەر دوو قاچەوە رایدەکرد. تاریك و نامۆ و چەماوە بوو، بەلام زانیم کە ئەو شتە پیاو بوو (واتە مرۆڤ بوو نەك ئاژەڵ).

I had a pistol with me, and that now made me feel a little braver. I started to walk to where the man was. He had been hiding behind a tree, but as soon as I came closer he stepped out to meet me.

دەمانچەیەکم پێبوو کە ئێستاکە ئەو دەمانچەیە ئازاتری کردم. دەستمکرد بە ڕۆشتن بۆ ئەو شوێنەی کە پیاوەکەی لێبوو. پیاوەکەش لە پشت دارێکەوە خۆی حەشاردەدا، بەلام هەرکە نزیکتر بوومەوە پیاوەکەش هاتە دەرەوە بمبینێت.

'who are you?' I asked.

'Ben Gunn', he answered, 'I'm poor Ben Gunn. And I haven't spoken to anyone for three years'.

'Three years', I cried.

پرسیارم کرد: " تۆ کێی؟

ئەویش وەڵامی دایەوەو ووتی: " بڕن گەن، من بڕێن گەنی هەژارم. بۆ ماوەی سێ ساڵە لەگەڵ کەس قسەم نەکردووە.
منیش هاوارمکرد: " سێ ساڵ".

I could now see that he was a white man, but that his skin had been burnt by the sun. he was wearing bits of old seamen's clothing and these bits were held together with sticks, various buttons and bits of string. He had an old belt around his waist, which was the only thing that looked normal about him.

ئێستاکە توانیم ببینم کە ئەو پیاوە پیاوێکی سپی پێست بوو، بەڵام پێستی بەهۆی خۆرەوە سوتا بوو (واتە تووشی سووتانەوەی بەر خۆر هاتبوو). پیاوەکە پارچەی جلوبەرگی دەریاوانی پۆشیبوو، هەروەها ئەم پارچە پەڕۆیانەش پێکەوە توند بەسترابوون بە قۆپچەی هەمەڕەنگ و پارچە دەزوو. پیاوەکە قایشێکی کۆنی هەبوو بە دەوری کەمەری کە تەنها شتێکی ئاسایی بوو لەو پیاوە دەرکەوتبوو.

'I was marooned three years ago', he said.

I had heard the word, and knew that it meant being left alone by your shipmates on a distant island with only a gun to help you survive.

پیاوەکە ووتی: " سێ ساڵ لەمەو پێش لێرە بەجێهێڵراوم".
گوێم لەم ووشەیە بوو، تێگەیشتم کە مەبەستت ئەوەبوو بە تەنها لەلایەن هاوڕێ دەریاوانەکانتەوە بەجێیان هێشتووی لە دوورگەیەکی دوور تەنها بە یەك دەمانچەوە بۆ ئەوەی لە ژیان بمێنیتەوە.

‘I’ve lived on goats, berries and fish since then’, he continued. ‘you haven’t got a bit of cheese with you, have you? I have been dreaming of cheese’.

**پیاوەکە بەردەوام بوو لە قسەکردن و ووتی:" لەسەر گۆشتی بزن و ماسی و توو ژیاوم هەر ئەوکاتەوەی لێرەم. ئایا کەمێك پەنیرت پێنیە؟خەون بە پەنیرەوە دەبینم".**

‘you’ll have lots of cheese, if only I go back on board the ship again’, I said.
‘On board?’ he repeated, ‘what’s your name?’ he asked.
‘Jim’, I told him.

**منیش ووتم:"تەنها ئەگەر بڕۆمە سەر کەشتیەکە دووبارە، ئەوە پەنیری زۆرت دەست دەکەوێت".**
**پیاوەکە دووبارە ووتی:"لەسەر کەشتیەکە"، پرسیاری لێکردم:"ناوت چییە؟**
**منیش ووتم: جیم.**

‘Well, Jim. I’ve thought about it on this lonely island, and I’m a changed man. You won’t see me drinking rum again…or well, just a little for luck, of course. And I’m going to be good. And’, he looked around him carefully, ‘I’m rich. Rich!’ and I’ll tell you something…. I’ll give you some of it, since you were the first man to find me!’

**پیاوەکە ووتی:" زۆرباشە جیم، بیرم لەمە کردۆتەوە لەم دوورگە چۆڵەدا، هەروەها ئێستا من پیاوێکی گۆڕاوم. تۆ نامبینیەوە دووبارە ڕەم بخۆمەوە... یان، زۆرباشە، بەدڵنیاییەوە تەنها کەمێك بۆ بەختەوەری دەخۆمەوە. من باش دەبم. پاشان پیاوەکە سەیری دەوروبەری خۆی کرد بە ووریاییەوەو ووتی:"من دەوڵەمەندم، دەوڵەمەند! و**

شتێکت پێدەڵێم....هەندێك لەو سامانەم پێت دەبەخشم چونکە تۆ یەکەم کەس بووی منت دۆزییەوە!

But with that he suddenly looked frightened and held my hand hard. 'it's not Flint's ship you're from, is it?' he asked.

'No, it's not Flint's ship. Flint is dead', I replied. 'but there are some of
Flint's crew aboard, which is a bad news for the rest of us'.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، پیاوەکە ترساو دەستی گرتم بە توندی و پرسیاری کرد و ووتی: " ئایا لەگەڵ کەشتییەکەی فلنت نیت، لەگەڵ ئەو کەشتیەی؟
ئەم پرسیارە هیوای پێ بەخشیم. لەوانەیە کەسێکم دۆزیبێتەوە کە یارمەتیم بدات. بۆیە وەلامم دایەوە: " نەخێر لەگەڵ کەشتیەکەی فلنت نەهاتووم، فلنت مردووە، بەلام هەندێك لە دەست و پێوەندەکانی فلنت لەسەر کەشتیەکەن، کە ئەمەش هەواڵێکی خراپە بۆ باقی هەمووومان".

'Not a man... with one leg?' he said.

'Silver?' I asked.

'Yes, that was his name. If you were sent by him, I'm a dead man', he said quietly.

پیاوەکە ووتی: " پیاوە یەك قاچەکە نەبێت؟
منیش ووتم: " سیلڤەر دەڵێی؟
پیاوەکە بە هێمنییەوە ووتی: "بەڵێ ئەوە ناوی بوو، ئەگەر لەلایەن ئەوەوە (واتە سیلڤەر) نێردراوی، ئەوە من مردووم (واتە دەمکوژن)".

I told him all about our voyage, and the crisis we were now in. he listened carefully and then he said, 'you're a good lad. Don't worry, Ben Gunn will help you. Now do

you think your squire would pay me well to help him? And take me back home on the ship?'

**منیش هەموو شتێکم سەبارەت بە گەشتەکەمان پێگووت و، ئەو ئەزمەیەی کە ئێستا تێیکەوتووین. پیاوەکەش بە وورياییەوە گوێی دەگرت و پاشان ووتی: "تۆ کوڕێکی باشی، پەرۆش مەبە بێ یارمەتیت دەدات، ئێستا پێت وایە کە ئاغاکەت پارەی باشم پێدەبەخشێت کە یارمەتی بدەم؟ و دەمباتەوە ماڵ بە کەشتیەکە؟**

'The squire is a gentleman and anyway, if we don't have the others, we will need you to help sail the ship home', I said.

'Well', he continued, 'I'll tell you some of my story. I were on Flint's ship when he went to bury the treasure.

**منیش ووتم: "ئاغا پیاوێکی خانەدانەو بەهەرحاڵ ئەگەر دەریاوانەکانی ترمان نەبێت، ئەوە پێویستمان بە تۆ دەبێت بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە بە کەشتیەکە".**
**پیاوەکەش ووتی: "زۆرباشە، هەندێك لە چیرۆکەکەی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە. من لەسەر کەشتیەکەی فلنت بووم کاتێك فلنت ڕۆشت بۆ شاردنەوەی گە نجینەکە لەژێر خاکدا.**

He took six strong sailors with him, but he came back alone, he had killed all. Billy Bones was the ship's mate, and Silver looked after the supplies. Well, I was on a different ship three years ago when I saw this island again.

**فلنت شەش دەریاوانی بەهێزی لەگەڵ خۆی برد، بەڵام بە تەنها گەڕایەوە-هەموویانی کوشت. بیلی بەونز دەریاوانێکی تر بوو، لۆنگ جۆن سیلڤەر چاودێری شت و مەکەکانی دەکرد. منیش لەسەر کەشتیەکی جیاواز بووم سێ ساڵ لەمەو پێش کاتێك دووبارە ئەم دوورگەیەم بینییەوە.**

'Boys', I said, 'let's stop and get Flint's treasure'. The captain wasn't happy, but for twelve days we looked for it, and found nothing. Every day they got angrier and then they said, 'here's a gun, a pickaxe and a spade. Find it yourself!' Then they all went aboard and left me here. But I've been busy these three years, see?' and guess what? He winked at me.

**لەوکاتەدا ووتم:" کوڕەکان، با بوەستین و گەنجینەکەی فلنت ببەین". کاپتنەکەشمان دڵخۆش نەبوو، بەڵام ماوەی ١٢ ڕۆژ بەدوای گەنجینەکە گەڕاین و هیچمان نەدۆزییەوە. هەموو ڕۆژێك دەریاوانەکان توڕەتر دەبوون و پاشان دەیانگووت:" دەمانچەو قوڵنگ و بێڵ و خاکەناس هەیەو خۆت بیدۆزەرەوە". ئینجا هەموویان گەڕانەوە بۆ سەر کەشتیەکەو لێرە بەجێیان هێشتم. بەڵام دەبینی ئەم سێ ساڵە سەرقاڵم؟و پێش بینی چی دەکەیت؟. پیاوەکە( واتە بێن ) چاوێکی لێداگرتم.**

'But how are we going to get back on board?' I asked.

'Ah, he said, 'I've made a small boat. I keep her under the white rock'.

Just then there was the sudden loud crash of a cannon.

'They have started to fight!' I cried.

**منیش پرسیارم کرد:"چۆن بگەڕێینەوە بۆ سەر کەشتیەکە؟**

**پیاوەکەش (بێن ) ووتی:" ئاه، بەلەمێکی بچوکم دروستکردووەو لەژێر بەردێکی سپی شاردوومەتەوە".**

**پاشان لەوکاتە، دەنگێکی بەرزی لەناکاوی تۆپ هات. منیش هاوارمکرد و ووتم:" ئەوان دەستیان کرد بەشەڕ کردن".**

## Episode 6: The stockade
## While Jim was ashore
## (the doctor now tells the story)

It was about half-past one when the two boats went ashore from the Hispaniola and the captain, the squire and I were talking in the cabin.

**زنجیرەی شەشەم : سەنگەرەکە**

**کاتێك جیم لە کەنار دەریا بوو**

**( ئێستاش دکتۆر لڤیسی چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە )**

**نزیکەی کاتژمێر یەك و نیو بوو کاتێك هەردوو بەلەمە لە کەشتیەکەوە بەرەو کەنار دەریاکە ڕۆشتن.من و کاپتن سمۆلیت و تریلۆنی لەناو کابینەی کەشتیەکە قسەمان دەکرد.**

Down came Hunter, who was one of the honest men, and he told us that Jim Hawkins had got into one of the boats and gone ashore with the other men. We trusted him, but we were worried about his safety.

**هەنتەر هاتە خوارەوە بۆ ناو کابینەکە،کە یەکێك بوو لە پیاوە ڕاستگۆکان و،هەنتەر پێی ووتین کە جیم هۆکنس ڕۆشتۆتە ناو یەکێك لە بەلەمەکان و ڕۆشتووە بۆ کەنار دەریا لەگەڵ دەریاوانەکانی تر.ئێمەش متمانەمان بە جیم کرد،بەڵام پەرۆش بووین سەبارەت بە سەلامەتی جیم.**

After a while Hunter and I decided to take another rowing-boat and go ashore in order to explore. The first two boats had gone far to the right, but Hunter and I came

straight in, in the direction of a stockade which we had seen on the treasure map. There was a man waiting in each of the boats on the shore. They saw us but did nothing.

**پاش ماوەیەك، من و هەنتەر بڕیارماندا بەلەمێکی سەوڵ لێدەر ببەین و بڕۆین بۆ کەنار دەریاکە بۆ ئەوەی بزانین چی ڕوو دەدات. هەردوو بەلەمەکەی پێشتر زۆر دوور کەوتبوونەوە بەلای ڕاستدا، بەلام من و هەنتەر ڕاست هاتینە ناو کەنار دەریاکە، لە ئاڕاستەی سەنگەرەکەوە کە لەسەر نەخشەی گەنجینەکە بینیمان بوو. پیاوێك هەبوو چاوەڕێی دەکرد لەلای هەریەکێك لە بەلەمەکان لە کەنار دەریاکەوە. ئەوان ئێمەیان بینی بەلام هیچیان نەکرد.**

When we landed, I jumped out holding two pistols and ran into the trees. I had not gone more than a hundred yards when I came to an open area and saw the stockade.

**کاتێك گەیشتینە کەنار دەریاکە، بازمدایە دەرەوەو دوو بار چەکم هەلگرتبوو، پاشان ڕامکرد بۆ ناو دارەکان. زیاد لە سەد پێ نەڕۆشتم کاتێك هاتم بۆ ڕووبەرێکی کراوەو سەنگەرەکەم بینی.**

There was a little hill that had a fresh water spring coming out of it. A strong wooden house, which was big enough to hold about twenty people, had been built by this spring. Each wall had several holes in it so that muskets could be fired from inside.

**گردێکی بچوك هەبوو کە کانییەکی ئاوی سازگاری هەبوو، ئاوە سازگارەکە لە گردەکەوە دەهاتە دەرەوە. ماڵێکی دارینی بەهێز کە بەگوێرەی پێویست گەورە بوو بۆ نزیکەی**

بیست کەس لە نزیك ئەم کانییە ئاوەوە بنیات نرابوو.هەر دیوارێکی خانووەکە چەند کونێکی هەبوو بۆ ئەوەی لەناوەوە بۆ دەرەوە چەك بەکاربهێنرێت بۆ گولە تەقاندن.

All around, a wide space had been cleared and then the stockade was completed by a tall fence. With its fresh water and strong walls, the stockade would be the best place for us to stay.

لە دەوروبەری خانووەکەدا بۆشاییەکی پان (فراوان) پاککرابووەو پاشان سەنگەرەکەش بە پەرژینێکی بەرز تەواو کرابوو.لەگەڵ ئاوە سازگارو دیوارە بەهێزەکانی سەنگەرەکە،سەنگەرەکە باشترین شوێن بوو بۆ مانەوەمان.

Suddenly from across the island, there came the terrible cry of a dying man. I made my decision in a moment, ran towards the shore and jumped into the boat. We were soon on board the ship again, where everyone was frightened and worried.

لەناکاوە،لە دوورگەکەوە هاوارێکی ترسناکی پیاوێك هات کە دەمرد.خێرا بڕیاری خۆمدا و ڕامکرد بەرەو کەنارەکە و بازمدایە ناو بەلەمەکە.دەستبەجێ لەسەر ڕووی کەشتیەکە بووین دووبارە،کە لەوێدا هەموو کەسێك ترساو پەرۆش بوون.

I told the captain my idea and we made a plan. We gave old Redruth three or four loaded muskets and left him on the ship to watch the six seamen that we did not trust. Then we started filling the boat with supplies: gun powder, muskets, bags of biscuits, small barrels of meat and brandy and of course my medicine chest.

**بیرۆکەکەی خۆم بە کاپتن سمۆلیت گووت و پلانێکمان دارشت. سێ یان چوار بار چەکمان بەخشی بە ڕێدروث و لەسەر کەشتیەکە بەجێمان هێشت بۆ ئەوەی چاودێری ئـەو شـەش دەریاوانە بکات کە متمانەمان پێیان نەبوو. ئینجا دەستمان کرد بە پڕکردنی بەلەمەکە بە شت و مەك: باروت و چەك و چەند جانتایەك بـسکیت و چـەند بـەرمیلێکی بـچوکی گۆشت و براندی و بەدڵنیاییەوە سندوقی دەرمانەکەشم برد.**

As we rowed to the shore one of the seamen much further up the beach saw us and ran into the woods. We unloaded the supplies and left Joyce who was another honest man to look after the supplies, Hunter and I returned for a second load.

**هەرکە سەوڵمان لێدا بـۆ کـەناری دەریاکـە، یـەکێك لـە دەریاوانـەکان دوورتـر لـە کەنارەکەوە ئێمەی بینـی و ڕایکـردە نـاو دارەکانـەوە. ئێمـەش بارەکانمـان داگـرت و جۆیسمان بەجێهێشت، جۆیس پیاوێکی ڕاسـتگۆی تـر بـوو، بـۆ چـاودێریکردنی شـت و مەکەکان. من و هەنتەر گەڕاینەوە بۆ دووەم بار.**

The reason why we risked a second trip was that though the majority of the crew were on the island, not one of them had a gun.

**هۆکاری ئەوەی کە گەشتی دووەممان خستە مەترسیەوە، ئـەوەبوو کـە زۆرینـەی دەسـتە دەریاوانەکان لە دوورگەکە بوون، هیچ یەکێکیشیان چەکی پێنەبوو.**

When we had unloaded after the second trip, Hunter and Joyce stayed ashore and I rowed as fast as I could back to the ship. Then, the squire, Smollett, Redruth, myself and one other sailor-Abraham Gray-climbed into the boat.

کاتێك پاش دووەم گەشت بارەکا نمان داگرت، هەنتەر و جۆیس لە کەنار دەریاکە مانەوەو منیش تا توانیم بە خێرایی سەوڵم لێدا بۆ گەڕانەوە بۆ سەر کەشتیەکە (هیسپانیۆلا). ئینجا تریلۆنی و کاپتن سمۆلێت و ڕێدروث و من و دەریاوانێکی تریش کە ناوی ئیبراهیم گرەی بوو- سەرکەوتینە ناو بەلەمەکە.

This fifth trip was dangerous. There were too many men. and we were also carrying another load of supplies. The sea had become rougher and several times some water came over the side of the boat.

ئەم گەشتەی پێنجەم ترسناك بوو. زۆر پیاو (دەریاوان) هەبوو، هەروەها ئێمەش بارێکی تری کەل و پەلمان گواستەوە. دەریاکە توندتر بوو (واتە شە پۆلی گەورەی زۆری دەدا) و هەندێك جاریش کەمێك ئاو دەهاتە سەر لایەکی بەلەمەکە.

Suddenly, the captain said, 'look behind us!'

The five men left on board were preparing to fire the cannon-we had forgotten all about this big powerful gun.

لەناکاوە کاپتن سمۆلێت ووتی: "سەیری دواوەمان بکە! تۆپەکە"

پێنج پیاوەکە کە لەسەر کەشتیەکە بەجێما بوون خۆیان ئامادە دەکرد بۆ هاویشتنی گولە تۆپ-هەموو شتێکمان لەبیر کردبوو سەبارەت بەم چەکە بەهێزە گەورەیە.

Israel was Flint's gunner', said Gray with fear in his voice.

Trelawney who was the best of us with a gun, loaded his musket. We stopped rowing, then he took aim and fired. Just at that moment Israel Hands who had been loading the gun, bent down.

ئیبراهیم گرەی بە ترسێکەوە لە دەنگیدا ووتی:" ئیزرەیل تۆپ هاوێژەری فلنت بوو".
تریلۆنی کە باشترینمان بوو لە ڕووی چەکەوە ، چەکەکەی هەڵگرت. لە سەوڵ لێدان وەستاین، ئینجا تریلۆنی ئامانجەکەی پێکاو گولەکەی تەقاند. هەر لەو کاتەدا ئیزرەیل هاندز کە چەکەکەی هەڵدەگرت، چەمایەوە بۆ خوارەوە.

The shot flew past him and hit one of the other men on deck. Then we heard shouting from the ship and also from the shore, where we could now see the other pirates coming out of the woods.

گولەکە بەلای ئیزرەیل تێپەڕی و دای لە یەکێك لە دەریاوانەکانی تر لەسەر کەشتیەکە. ئینجا گوێمان لە هاوارکردن بوو لە سەر کەشتیەکەو هەروەها لە کەنار دەریاکەشەوە کە تیایدا ئێستاکە توانیمان چەتە دەریاییەکانی تر ببینین کە لەناو دارەکانەوە دەهاتنە دەرەوە.

It was long until a shot from the cannon fell right by our boat, and she began to sink. Luckily we were not far from the shore. As we walked through the waves and up onto the beach our poor boat and about half of our powder and supplies lay underwater behind us. To make things worse we could now hear shouting coming from the woods nearby.

زۆری پێنەچوو تاکو گولەیەکی هاوێشتراو لە تۆپەکەوە ڕاست بەر بەلەمەکەمان کەوت، بەلەمەکەش دەستیکرد بە نوقم بوون. خۆشبەختانە لە کەنار دەریاکەوە زۆر دوور نەبووین. کاتێك بەناو شەپۆلەکاندا ڕۆشتین بە پێ و گەیشتینە سەر کەناردکە، بەلەمە هەژارەکەمان و نزیکەی نیوەی باروت و پێداویستییەکانمان لە پشتمانەوە ژێر ناو

کەوتن. لەوەش خراپتر ڕویدا، ئەوەبوو کە ئێستاکە توانیمان گوێمان لە هاوارکردن بێت کە لەناو دارەکانەوە دەهات لە نزیک کەنارەکەوە.

**The first day in the stockade**

We ran as quickly as we could to the stockade, and at every step we could hear the pirates' voice more loudly. Just as we reached the stockade seven men appeared out of the woods.

**یەکەم ڕۆژی ناو سەنگەرەکە**

تا توانیمان بەخێرایی ڕامانکرد بۆ سەنگەرەکەو، لە هەر هەنگاوێکدا توانیمان گوێ بیستی دەنگەکانی چەتەکان بین کە بەرزتر بوو دەنگیان. هەرکە گەیشتینە سەنگەرەکە، حەوت پیاو لە ناو دارەکانەوە دەرکەوتن.

The squire and I fired, and so did Hunter and Joyce from inside the log-house. One of the mutineers fell to the ground and the rest turned and ran into the trees. We went to look at the man who had fallen and at that moment a shot came out of the trees and hit poor Tom Redruth.

من و تریلۆنی گولەمان تەقاند، هەروەها هەنتەرو جۆیسیش لەناو خانووە دارەکەوە گولەیان تەقاند. یەکێك لە دەریاوانە یاخیبووەکان کەوتە سەر زەوی و ئەوانی تریش گەڕانەوەو ڕایانکردە ناو دارەکانەوە. ئێمەش ڕۆشتین بۆ بینینی پیاوەکە کە کەوتە سەر زەوی، و لەو کاتەدا گولەیەك لەناو دارەکانەوە تەقێنراو دای لە تۆم ڕێدروثی داماو.

He carried out with pain, and we carried him, bleeding inside the wooden house.

The squire fell down beside him and kissed his hand, crying like a child. Redruth was a good man and had always followed orders silently and well.

تۆم بە ئازارەوە هاواری دەکرد، و ئێمەش تۆم ڕێدروسمان هەڵگرت کە تووشی خوێن بەربوون هات، و بردمان بۆناو خانووە دارەکە.
تریلۆنی لەتەنیشت تۆم کەوتە سەر زەوی و دەستی تۆم ڕێدروثی ماچکرد و وەك منداڵ دەگریا. تۆم ڕێدروس پیاوێکی باش بوو، و هەمیشە شوێنی فەرمانەکان دەکەوت بە بێدەنگی و بەباشی.

Not longer after that, he closed his eyes and died.

The captain whose pockets were full of things he had taken from the ship, took out a flag and put it carefully over the Tom's body. Then he put another on a tall tree branch high above.

پاش ئەوە ئەوەندەی پێنەچوو، تۆم چاوەکانی داخست و مرد.
کاپتن سمۆلێت کە گیرفانەکانی پڕ بوون لە شت کە لە کەشتیەکە هێنای بوو، ئاڵایەکی دەرهێنایە دەرەوەو بە وریاییەوە دای بەسەر لاشەی تۆم. ئینجا ئاڵایەکی تریشی دانا لەسەرەوەی لقی دارێکی بەرز.

Following that, he came to me and spoke quietly. 'Dr. Livesey', he said. 'how many weeks does it last until Blandly will send a ship to look for us?'

بەدوای ئەودا، کاپتن سمۆلێت هات بۆ لام و بە هێمنیەوە قسەی بۆ کردم. کاپتن ووتی: "دکتۆر لڤیسی، چەند هەفتەی تری پێدەچێت تاکو بلاندلی کەشتیەك دەنێرێت بۆ گەڕان بەدواماندا؟

I told him it would be months, and not weeks.

'Well, sir, then it's very bad that we lost the second load of supplies. The food supplies are very limited', he replied.

**منیش بە کاپتنم ووت کە چەند مانگێکە نەك هەفتە.**

**ئەویش( واتە سمۆلێت ) وەلامی دایەوەو ووتی: " زۆرباشە گەورەم،زۆر خرا پـە کـە دووەم باری پێداویـستییەکا نمان لەدەسـتدا. خواردەمەنییـەکان زۆر سـنوردارن ( واتـە بـەش ناکات )".**

Just then, with a loud roar, a cannon ball landed inside the stockade. ‘perhaps they can see the flag from the ship, ‘said the captain. We were safe enough inside, but the balls continued to fall throughout the evening.

**پاشان گولە تۆپێك بەدەنگێکی بـەرزەوە کەوتـە نـاو سـەنگەرەکەوە.کـا پتن سمۆلێـت ووتـی: "لەوانەیـە دەریاوانـە یاخیبووەکـان بتـوانن لـە کەشـتیەکەوە ئالاکـە ببیـنن.لـەناوەوەی سـەنگەرەکە سـەلامەت بـووین،بـەلام گولـە تۆپـەکان بـەردەوام دەهاویشتران بەدرێژایی ئەو ئێوارەیە.**

‘The woods between us and the beach are probably safe’, said the captain after several hours. ‘and it will now be low tide. Our supplies shouldn’t be underwater now. I need some volunteers to go and bring them back’.

**کاپتن سمۆلێت پاش چەند کاتژمێرێك ووتی: "دارەکانی نێوانی ئێمەو کـەنار دەریاکـە لەوانەیە سەلامەت بن،و ئێستاش ئاستی دەریاکە داکشاوە دەبێت. پێداویستییەکا نمان نابێـت ئێـستا ژێـر نـاو بکـەوێت. پێویـستم بـە هەنـدێ خۆبـەخش هەیـە بـڕۆن و پێداویستییەکان بگەڕێننەوە.**

Gray and Hunter went quietly down to the shore, but they were too late. Four or five of the mutineers were already there, loading our supplies onto one of their small

boats. Silver was in the boat, and all the men now had muskets, which must have been kept secretly on the ship.

ئیبراهیم گرەی و هەنتەر بە هێمنییەوە ڕۆشتنە خوارەوە بۆ کەنار دەریاکە، بەڵام زۆر دواکەوتن. چوار یان پێنج یاخیبوو پێشتر لەوێ بوون (واتە لە کەنار دەریاکە)، ئەو یاخیبوانە پێداویستییەکانی ئێمەیان بارکردبوو بۆناو یەکێك لە بەلەمە بچوکەکانیان. سیلڤەر لەناو بەلەمەکە بوو، ئێستاش هەموو دەریاوانەکان چەکیان پێبوو، کە بە نهێنی لەسەر کەشتیەکە شاردبوویانەوە.

There were now only six of us left, with food supplies to last us for only about ten days. Redruth was dead, and we didn't know what had happened to Jim Hawkins.

تەنها شەش کەسمان مابوویەوە، لەگەڵ خواردەمەنی کە تەنها بەشی دە (١٠) ڕۆژمانی دەکرد. ڕێدروث مردبوو، و ئێمەش نەمانزانی چی بەسەر جیم هۆکنس هاتووە.

Then suddenly, there was a call from outside.

'Doctor! squire! Captian!' cried a voice.

And I ran to the door and saw Jim Hawkins climbing safely over the stockade fence.

ئینجا لەناکاوە، دەنگی هاوارێك لەدەرەوە هات.

دەنگێك هاواریکرد: " دکتۆر، ئاغا، کاپتن! ".

منیش ڕامکرد بۆ لای دەرگاکەو بینیم جیم هۆکنسەو بەسەلامەتییەوە بەسەر پەرژینی سەنگەرەکە سەرکەوت.

**I join the others**
**(Jim Hawkins continues the story)**

As soon as Ben Gunn saw the flag on the stockade, he stopped walking. 'Now', he said, 'when you see your friends, tell the squire or the doctor to come and see me.

**پەیوەندی بە دەریاوانەکانی تر دەکەم**
**( جیم هۆکنز بەردەوام دەبێت لە گێڕانەوەی چیرۆکەکە )**

هەرکە بێن گەن ئاڵای سەر سەنگەرەکەی بینی، لە پیاسەکردن وەستا. بێن ووتی: "ئێستا، کاتێك هاوڕێکانت دەبینی، بە تریلۆنی و دکتۆر بڵێ با بێن و بمبینن.

You know where to find me-up in the woods where you saw me today. Tell them there's a good reason why I'm hiding'.

'Good', I said. 'can I go now?'

ئەو شوێنە دەزانیت کە تیایدا بمدۆزیتەوە-لەسەرەوەی ناو دارەکان ئەو شوێنەی کە تیایدا منت بینی ئەمڕۆ. بە ئەوان (واتە تریلۆنی و لڤیسی) بڵێ هۆکارێکی باش هەیە کە بۆچی خۆم حەشار دەدەم".

منیش ووتم: "باشە، ئێستا دەتوانم بڕۆم؟".

The cannon suddenly started firing again and we ran in different directions into the trees. Slowly I went down the hill closer to the sea, and soon I could see the ship, and I could see the Holly Rodger-the black flag of piracy-flying from her mast.

**تۆپەکە لەناکاوە دووبارە دەستیکرد بە تۆپ هاویشتن و ئێمەش بە ناڕاستەی جیاواز ڕامانکرد بۆناو دارەکان. بەهێواشی ڕۆشتمە خوارەوەی گردەکە کە نزیکتر بوو لە دەریاکەوە، و هەر زوو توانیم کەشتی هیسپانیۆلا ببینم، و توانیم جۆلی ڕۆگەر ببینم- کە ئاڵا ڕەشەکەی چەتەکان بوو-کە لەدار ئاڵاکەیەوە بە هەوادا دەفڕی.**

As I was going down towards the stockade, I saw a large white rock some distance further along the beach. I thought that this might be the rock that Ben Gunn had spoken about, and that one day, if I needed a boat, I would know where to look.

**کاتێك بەرەو سەنگەرەکە ڕۆشتمە خوارەوە، بەردێکی (بەڕێکی) سپی گەورەم بینی کە کەمێك دوورتر بوو لە کەنار دەریاکەوە. پێم وابوو کە دەبێت ئەمە ئەو بەردە بێت کە بێن گەن لەبارەیەوە قسەی کرد، و ڕۆژێك ئەگەر پێویستم بە بەلەم بوو ئەوە دەمزانی لەکوێ بگەڕێم.**

There was a warm welcome for me at the stockade and I happily told them my story. Later that evening we buried old Tom Redruth in the sand and stood silently around him for a while. Then we ate some meat and drank some brandy.

**لە سەنگەرەکەدا بەخێرهاتنێکی گەرمیان کردم و بە خۆشحاڵیەوە بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕانەوە( واتە بۆ لڤیسی و تریلۆنی و سمۆلیت ). دواتر ئەو ئێوارەیە تۆم ڕێدروثمان ناشت لەناو لمەکەو بە بێدەنگییەوە بە دەوری تەرمەکەی تۆم وەستا بووین بۆ ماوەیەك. ئینجا هەندێك گۆشتمان خواردو هەندێك براندیمان خواردەوە.**

The squire, the doctor and the captain discussed what to do. We had very little food, but it was decided that we

would fight the pirates as best we could. There were fifteen of them now, and two of those had been shot and hurt.

ترێلۆنی و لڤیسی و کاپتن سمۆلێت باسی ئەوەیان کرد چی بکەن. خواردنێکی زۆر کەممان هەبوو، بەڵام بڕیار درابوو کە شەڕ دەکەین لەگەڵ چەتەکان بەباشترین شێوە بتوانین. ئێستا پانزە دەریاوانیان مابوو، و دوانیان گولەیان بەرکەوتبوو و ئازاریان هەبوو.

To help us, on the other hand, there was also the rum the pirates were drinking: though the pirates were half a mile away, we could hear them well, singing and shouting late into the night. I was very tired, and when at last I go to sleep, I slept like a log.

لەلایەکی تردەوە بۆ یارمەتیدانی ئێمە، خواردنەوەی ڕەم هەبوو کە چەتەکان دەیانخواردەوە؛ هەرچەندە چەتەکان نیو میل دوور بوون، ئێمە بەباشی گوێمان لە دەنگیان بوو، کە گۆرانیان دەووت و هاواریان دەکرد لە دردنگانی شەودا. زۆر ماندوو بووم و کاتێك لە کۆتاییدا خەوم لێکەوت، زۆر بەقوڵی و بێ جووڵە وەك پارچە تەختەیەك خەوتم.

**Silver's visit**

I was woken up by the sound of voices early the next morning.

'there's a white flag!' I heard someone said, 'It's Silver!'

**سەردانەکەی سیلڤەر**

سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر بەهۆی دەنگە دەنگەوە خەبەرم بوویەوە.
بیستم کەسێك کە سیلڤەر بوو ووتی: "ئەوە ئاڵا سپییەکەیە".

There was a man with Silver who shouted, 'Captain Silver, sir, wants to talk and make peace'.

'I don't know him. Who's he?' cried the captain, adding to himself. 'So it's Captain now, is it?'

پیاوێك لەگەڵ سیلڤەر بوو و هاواریکرد ووتی: کاپتن سیلڤەر، گەورەم دەیەوێت قسە بکات و ئاشتەوایی دروست بکات".
کاپتن سمۆڵیت هاواریکرد و ووتی: "من ئەو کەسە ناناسم، کێیە؟، سمۆڵیت ئەمەشی لەبەر خۆیەوە ووت: "کەواتە ئەو کەسە کاپتنە ئێستا، وایە؟

And now Silver answered, 'it's me. These poor men chose me to be the captain, after you deserted the ship. We want to talk to you and agree something'.

لۆنگ جۆن سیلڤەر وەڵامی دایەوەو ووتی: " ئەو کاپتنە منم، ئەم پیاوە هەژارانە منیان هەڵبژاردووە ببم بە کاپتن پاش ئەوەی تۆ کەشتیەکەت بەجێهێشت. ئێمە دەمانەوێت قسەت لەگەڵ بکەین و لەسەر شتێك ڕێکبکەوین".

And then, Silver came up close to the fence, threw over his crutch, and with a great effort managed to climb over. When he finally got near the log-house, he sat down heavily on the sand.

ئینجا سیلڤەر هاتە سەرەوەو لە پەرژینەکە نزیک بوویەوەو دارشەقەکەی فرێداو بەهەوڵێکی زۆرەوە هەوڵی سەرکەوتنیدا بەسەر پەرژینەکە.کاتێك لە کۆتاییدا سیلڤەر لە خانووە دارینەکە نزیك بوویەوە، بە قورسیەوە لەسەر لمەکە دانیشت".

‘Well, captain’, he said, ‘we want that treasure. You’ve got a map, haven’t you? And we want it. If you give us the map, and stop shooting poor seamen, we’ll give you a choice.

سیلڤەر ووتی: "زۆرباشە کاپتن سمۆلیت، ئێمە ئەو گە نجینەمان دەوێت، تۆ نەخشەکەت لایە، لات نیە؟ ئێمەش ئەو نەخشەمان دەوێت. ئەگەر ئەو نەخشەمان پێبدەیت، و لە تەقەکردن لە دەریاوانە هەژارەکان بوەستیت، ئەوە هەڵبژاردنێکت ( دەرفەت ) پێدەدەین.

You help us get the treasure, then you come with us on the ship, and I promise you I’ll leave you somewhere safe ashore. Or you can stay here. We’ll give you half of the supplies, and I promise I’ll tell the first ship we see to come and get you’.

ئێوە یارمەتی ئێمە دەدەن بۆ دەستکەوتنی گە نجینەکە، ئینجا دەگەڕێنەوە سەر کەشتیەکە لەگەڵمان، و منیش پە یمانتان دەدەمێ لە شوێنێکی کەنار دەریا بە سەلامەتی بەجێتاندەهێڵم. یان دەتوانن لێرە بمێننەوەو نیوەی پێداویستییەکانتان پێدەدەین، و پە یمان دەدەم کە یەکەم کەشتی ببینم پێی بڵێم بێت و بتانباتەوە".

'Now you will hear me', said the captain. 'If you come here one by one without guns, I'll put you all in irons and take you home to England for fair trial. If you don't, you are beaten anyway. You can't find the treasure, you can't sail the ship, and you can't even fight us. Now, off you go'.

**کاپتن سمۆلیت ووتی: "ئێستا تۆ گوێت لێمە، ئەگەر ئێوە یەك یەك بێنە ئێرە بەبێ چەك ئەوە هەمووتان کەلەپچە دەکەم و دەتانبەمەوە بۆ ئینگلاند (بریتانیا) بۆ دادگاییکردنی دادپەروەرانە. ئەگەریش نەیەن بۆ ئێرە ئەوە بەهەرحاڵ لێتان دەدرێت. ناتوانن گەنجینەکە بدۆزنەوە، ناتوانن کەشتیوانی کەشتیەکە بکەن، تەنانەت ناشتوانن شەڕمان لەگەڵ بکەن. ئێستاش بڕۆ".**

Long John Silver was red with anger. With much difficulty, he pulled himself along the ground to where his crutch lay. Then he stood up and spat in the spring.

**سیلڤەر سور بوویەوەو توڕە بوو. بە نارەحەتیەوە خۆی بە زەوییەکە ڕاکێشا بۆ ئەو شوێنەی دارشەقەکەی لێکەوتبوو. ئینجا سیلڤەر هەستایە سەرپێ و تفی کردە ناو کانیاوەکەوە.**

'There!' he cried, 'that's what I think of you! I'm going to destroy this old stockade, and those that die will be the lucky ones!'

And swearing loudly, he moved away, pulled himself slowly over the fence and was gone.

**سیلڤەر هاواریکرد و ووتی: " لەوێ، هەر ئەوەبوو سەبارەت بە تۆ بیرم لێکردبووەوە! ئەم سەنگەرە کۆنەیە تێکدەشکێنم، و ئەوانەشی کە دەمرن لە بەختەوەران دەبن".**

سیلڤەر بەدەنگی بەرز جنێوی دەداو دوور کەوتەوەو بەهێواشی خۆی خستە سەر پەرژینەکەو ڕۆشت.

The captain soon made sure that we all had muskets and told us where to stand. There were more of them than were of us, but at least we had the stockade.

کاپتن سمۆلیت هەر زوو دڵنیای کردەوە کە هەمووومان چەکمان پێیەو پێی ووتین لە کوێ بوەستین. لەو شوێنەدا ئەوان لە ئێمە زیاتر بوون، بەڵام بەلایەنی کەمەوە ئێمە سەنگەرەکەمان هەبوو.

After an hour of waiting, a group of mutineers suddenly appeared from the woods on the north side and ran towards the fence. At the same time, shots came from the woods to the other side.

پاش یەك کاتژمێر چاوەڕوان کردن، کۆمەڵێك یاخیبوو لەناکاوە لەلای دارەکانەوە دەرکەوتن لە بەشی باکورەوە بەرەو پەرژینەکە ڕایانکرد. لەهەمان کاتدا، لەناو دارەکانەوە تەقەکردن دەهات بۆ لایەکەی تری پەرژینەکە.

The squire and Gray fired again and again from inside the log-house and hit three men as they climbed over the fence-two of them were shot dead, and the third ran away. But four more had got inside the fence, and then they were on us with pistols and swords.

تریلۆنی و ئیبراهیم گرەی دووبارەو دووبارە لەناو خانووە دارینەکەوە گولەیان دەتەقاند و دایان لە سێ پیاو (یاخیبوو) کاتێك سەرکەوتنە سەر پەرژینەکە-دووان لەو پیاوانە (یاخیبووانە) بەهۆی بەرکەوتنی گولەوە مردن و، سێهەم یاخیبوو

ڕایکرد. بەڵام زیاتر لە چوار یاخیبوو هاتنە ناو پەرژینەکە، وئینجا بە چەك و شمشێر هاتنە سەرمان.

One of the pirates put his hands on Hunter's musket, pulled it through the hole in the stockade wall, and used it to hit Hunter hard on the head. He fell to the floor and didn't move. We picked up swords and ran out of the house to fight.

یەکێك لە چەتە دەریاییەکان دەستەکانی خستە سەر چەکەکەی هەنتەر، و چەکەکەی هەنتەری بەناو کونی دیواری سەنگەرەکە ڕاکێشا، و چەکەکەی هەنتەری بەکارهێنا بۆ لێدانی سەری هەنتەر بە توندی. هەنتەر کەوتە سەر زەوی و نەجوڵا. ئێمەش شمشێرەکانمان هەڵگرت و لە خانووەکە هاتینە دەرەوە بۆ شەڕکردن.

I saw the doctor cut a man across the face, and Abraham Gray cut down another man who was coming to attack me. After a few minutes of terrible fighting, it was all over. We had won. Six of their men lay dead, or dying and the rest had run away.

دکتۆر لڤسیم بینی پیاوێکی (یاخیبوویەکی) لە دەموچاوەوە لەت کرد، وئیبراهیم گرەیم بینی یاخیبوویەکی تری لەت کرد کە ئەو یاخیبووە بۆ هێرشکردنە سەری من دەهات. پاش چەند خولەکێکی شەڕێکی ترسناك، شەڕەکە تەواو بوو. ئێمە شەڕەکەمان بردەوە. شەش یاخیبوو لە پیاوەکانی ئەوان مردن، و ئەوانی تریان هەڵهاتن.

But when we went back to the log-house, we saw that Hunter was lying on the floor. Joyce had been shot dead, and the squire was holding the captain, who was badly hurt.

بەڵام کاتێك گەڕاینەوە بۆ خانووە دارینەکە، بینیمان هەنتەر لەسەر زەوییەکە پاڵکەتووە. جۆیس گولەی بەرکەوتووەو مردووە، و تریلۆنی کاپتن سمۆلێتی هەڵگدەگرت کە بە سەختی بریندار کرابوو.

## Episode 7: My sea adventure
## How my sea adventure began

The mutineers didn't return that say. However, Hunter never woke up and died some time the following night. The captain had been shot in the shoulder and the leg.

## زنجیرەی حەوتەم:
## سەرکەشییە دەریاییەکەم
## سەرکەشییە دەریاییەکەم چۆن دەستیپێکرد

ئەو ڕۆژە یاخیبووەکان نەگەڕانەوە.هەرچۆنێك بێت،هەنتەر هەرگیز دووبارە خەبەری نەبوویەوەو شەوی دواتر پاش ماوەیەك مرد.کاپتن سمۆلێت شانی و لاقی بەر گولە کەوتبوو.

However, the doctor stated that he would certainly recover provided that he was given enough time to rest. That left us just four healthy men: the doctor, the squire, Gray and myself.

هەرچۆنێك بێت،دکتۆر لڤیسی ڕایگەیاند کە بەدڵنیاییەوە چارەسەری دەکات،و لڤیسی ئەوەشی ووت کە کاپتن سمۆلێت کاتی پێویستی پێدەدرێت بۆ پشوودان.ئەوەش تەنها چوار پیاوی لەش ساغی بۆ بەجێهێشتین:من و دکتۆر لڤیسی و تریلۆنی و ئیبراهیم گرەی بووین.

After eating lunch, the doctor picked up two pistols, a musket, a sword and the treasure map and walked quickly into the woods to the north. I thought that he was probably going to see Ben Gunn.

پاش خواردنی نانی نیوەڕۆ، دکتۆر لڤیسی دوو دەمانچەو تفەنگێك و شمشێرێك و نەخشەی گە نجینەکەی هەڵگرت و بەخێرایی ڕۆشت بۆناو دارەکان بەرەو باکور. پێم وابوو دکتۆر لڤیسی لەوانەیە بڕوات بۆ بینینی بێن گەن.

I started to wash out the log-house. It was hot and it was filled with blood and dead bodies. I hated it and wanted to get away. After a moment's thought, and while the squire and Gray were not looking, I filled my pockets with biscuits, took two pistols and immediately left the log-house.

دەستمکرد بە شۆردنی خانووە دارینەکە. خانووەکە گەرم و پڕ بوو لە خوێن و لاشەی مردوو. ڕقم لەو خانووە بوویەوەو ویستم دوور بکەومەوە، پاش چرکەیەك بیرکردنەوە، وکاتێك تریلۆنی و ئیبراهیم گرەی تەماشایان نەدەکرد. گیرفانەکانم پڕ کرد لە بیسکیت و دوو دەمانچەم برد و ڕاستەوخۆ خانووە دارینەکەم بەجێهێشت.

This was the second reckless thing I had done, and this time I had left only two men to protect the stockade. But like the first act, it would help to save us. I had decided to go down to the white rock and find Ben Gunn's boat.

ئەمە دووەم شتی بێباك ( سەرکەشی ) بوو کە ئەنجاممدا، و ئەم جارە تەنها دوو پیاوم بەجێهێشت بۆ پاراستنی سەنگەرەکە. بەڵام وەکو یەکەم کارم، یارمەتیداین بۆ ڕزگارکردنمان. بڕیارمدا بڕۆمە خوارەوەی بەردە سپییەکەو بەلەمەکەی بێن گەن بدۆزمەوە.

It was beginning to get dark now, and as I walked among the trees I saw a boat, with Silver and some other men aboard, rowing from the Hispaniola to the beach.

ئێستاکە بەرەو تاریک بوون دەڕۆشت، وکاتێک بەناو دارەکان ڕۆشتم بەلەمێکم بینی لەگەڵ سیلڤەر و چەند پیاوێکی تر لەسەر بەلەمەکە کە لە کەشتیەکەوە بەرەو کەنار دەریاکە سەوڵیان لێدەدا.

I went on to find the white rock as the light died, and it was almost totally dark by the time I finally found the little boat. It was very small, even for me, and it was made from a frame of rough pieces of wood covered in goat skins.

بەردەوام بووم لەگەڕان بۆ دۆزینەوەی بەردە سپییەکەو کاتێک ڕووناکیەکە نەما، ونزیکەی بەتەواوی تاریک بوو لەو کاتە لەکۆتاییدا بەلەمە بچوکەکەم دۆزییەوە. بەلەمەکە زۆر بچوک بوو، تەنانەت بۆ منیش بچوک بوو، وبەلەمەکە لە چوارچێوەی پارچە ڕەقی دار دروستکرابوو بە پێستی بزن دا پۆشرابوو.

There was also a paddle. Now that I had found the boat, I had another idea. I could use the boat to go secretly out to the ship in the dark, and cut her free from her anchor to stop the pirates going to sea.

بەلەمەکە سەوڵێکی هەبوو، ئێستاکە بەلەمەکەم دۆزیوەتەوە، بیرۆکەیەکی ترم هەبوو. دەتوانم بەلەمەکە بەکاربهێنم بەنهێنییەوە بڕۆمە دەرەوە بۆ سەر کەشتیەکە (هیسپانیۆلا) بەناو ئەو کەش و هەوا تاریکییە، و لەنگەری کەشتیەکە ببڕم و کەشتیەکە دوور بکەوێتەوەو بۆ ئەوەی چەتەکان بوەستێنم بڕۆنە دەریاکەوە بۆناو کەشتیەکە.

By now it was very dark. I could see the pirates' campfire further along the beach, and just one light out in

the water which showed me where the ship lay. I carried the little boat down to the water, and with some difficulty climbed in.

**بەڵام ئێستاکە( لەو کاتەدا ) زۆر تاریك بوو.توانیم کامپی ئاگرینی چەتەکان ببینم کە لەلای کەنار دەریاکەوە بوو.تەنها یەك ڕووناکی کە لە ئاوەکەیدا پیشانیدام کە کەشتی هیسپانیۆلا لە کوێ لەنگەری گرتووە.بەلەمە بچوکەکەم هەڵگرتوو بردمە ناو ئاوەکە،وبە هەندێك ناڕەحەتیەوە سەرکەوتمە ناو بەلەمەکە.**

The tide had changed but despite this, I managed at last to get near the ship. When I found the anchor rope, I took out my knife and started to cut it. As I was cutting, I could hear two men arguing and fighting in the ship above me.

**ئاستی دەریاکە گۆڕاو بەرزبوویەوە.کارێکی سەخت بوو بەلەمە بچوکەکە بەئاڕاستەی دروست بجوڵێنم،بەڵام،سەرەڕای ئەمە،لە کۆتاییدا لە کەشتیەکە نزیك بوومەوە.کاتێك گوریسی لەنگەرەکەم دۆزییەوە،چەقۆکەم دەرهێناو دەستمکرد بە بڕینی گوریسی لەنگەرەکە.کاتێك گوریسەکەم دەبڕی،توانیم گوێبیستی دوو پیاو بم کە مناقشەو شەڕیان دەکرد لەسەرمەوە لەسەر کەشتیەکە.**

It was clear that they had drunk a lot of rum, and I knew one of the voices-it was the voice of Israel Hands. On finally cutting through the rope, the ship suddenly started to turn and move with the tide along the narrow passage of water.

**ئاشکرابوو کە ئەو دوو دەریاوانە زۆریان خواردبوویەوە لە ڕەم،و یەکێك لە دەنگەکانم ناسییەوە-دەنگی ئیزرەیل هاندس بوو.لەکۆتایی بڕینی گوریسی لەنگەرەکەدا**

**کەشتیەکە دەستیکرد بە خولانەوەو لەگەڵ ئاستی دەریاکە جوڵایەوە بەناو ڕێگە باریکەکەی ئاوەکە.**

It moved quickly and my boat moved along with it. At one point I saw that I was close to the waves and the beach where they were breaking. The campfire was closer now, with the pirates all around it, and I heard words from a song I had heard them sing many times on the ship:

*'But one of her crew alive,*
*What put to sea with seventy-five'.*

**کەشتیەکە بەخێرایی جوڵاو، و بەلەمەکەی منیش لەگەڵ کەشتیەکە جوڵا. لە خاڵێکدا بینیم کە لە شەپۆلی ئاوەکە و کەنار دەریاکە نزیکم لەو شوێنەی چەتەکان تێکشکان. کامپە ئاگرینەکەیان (واتە کامپە و ئاگری لە تەنیشت کراوە) ئێستاکە نزیکترەو چەتەکان هەموویان دەوری کامپەکەیان داوە، ووشەی ناو گۆرانیەکەم بیست کە ئەوان چەند جارێك لەسەر کەشتیەکە بە گۆرانیەوە دەیانگووت:**

***بەڵام تەنها یەك دەریاوانی کەشتیەکە زیندووە.***

***کە بە حەفتاو پێنج دەریاوانەوە لە دەریا بوو".***

I lay down in the bottom of that very small little boat, and I believed that I was going to be thrown out into the sea to die. I must have stayed like that for hours, being thrown about on the waves, expecting to die at any moment, but also exhausted. Slowly I fell asleep and dreamed about home and The Admiral Benbow.

لە بنی ئەو بەلەمە زۆر بچوکە ڕاکشام،و بڕوام وابوو کە دەکەومە ناو دەریاکەوەو دەمرم. پێویست بوو بەو شێوەیە بمێنمەوە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك،کە لەسەر شە پۆلەکانی ناوەکە بەرزو نزم دەبوومەوە، چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد لەهەر کاتێك بێت دەمرم، بەلاّم هەروەها زۆر ماندوو بووم. بەهێواشی خەوم لێکەوت و دەربارەی ماڵەوەو خانەی ئەدمیراڵ بێنبەو خەونم بینی.

## Alone at sea

When I woke the sun was up, and I found myself about a quarter of a mile off the south west end of Treasure Island. However, the shore was very rocky and the sea rough, so I could not risk trying to go ashore.

### بەتەنها لە دەریادا

کاتێك خەبەرم بوویەوە خۆرەکە بەرز بوو، و خۆمم لە نزیکەی چارەکە میلێکــی دوور لــە کۆتایی ڕۆژئاوای باشوری دوورگەی گە نجینە دۆزییەوە. هەرچۆنێك بێت کەنار دەریاکــە زۆر بەردین بوو و دەریاکەش توندوتیژ بوو، ئینجا نەمتوانی هەوڵبــدەم بڕۆمــە کــەنار دەریاکە.

I tried to paddle, but the boat was difficult to steer and water started to come in. I left horribly frightened. How could I hope to reach land?

Some time later, as I moved around the coast, I suddenly saw the ship in front of me. less than half a mile away.

هەوڵمدا سەوڵ لێبدەم، بەلام بەلەمەکــە زۆر زەحمــەت بــوو ســەوڵی لێبــدرێت و ئــاوی دەریاکەش دەستیکرد بە هاتنە ژوورەوە بۆناو بەلەمەکە. بەشێوەیەکی خراپ هەستم بــە ترس کرد. چۆن توانیم هیوای ئەوە بخوازم بگەمە وشکانی؟

پاش ماوەیــەکی دواتــر، کاتێــك بــەرەو دەوری کەنارەکــە ڕۆشــتم، لــەناکاوە کەشــتی هیسپانیۆلام بینی لە پێشمەوەیە کە کەمتر لەنیو میل دوور بوو.

Her sails were moving freely in the wind, and it was clear to me that no one was sailing her. I thought that the two men must be asleep from the rum. If only I could get on board, I might be able to return her to her captain.

چارۆکەکانی کەشتیەکە لەهەوادا دەجولانەوە،و ئاشکرابوو بۆ من کە هیچ کەسێك کەشتیوانی کەشتیەکەی نەدەکرد. پێم وابوو کە دوو پیاوەکە دەبێت بەهۆی خواردنەوەی ڕەمەوە نووستبن. ئەگەر تەنها بمتوانییایە بگەمە سەر کەشتیەکە، لەوانەیە بمتوانیایە کەشتیەکە بگەڕێنمەوە بۆ کاپتنەکەی (واتە بۆ سمۆلیت).

I knew what I needed to do. I sat up and started paddling again. Despite water coming into the boat, I went on paddling until at last I was close to the ship. I could see that one of the booms was hanging out over the side of the ship, and when a large wave came I pushed myself up and reached for it.

زانیم پێویستە چی بکەم. ئەخەوتم و دووبارە دەستمکرد بە سەوڵ لێدانی بەلەمەکە. سەرەڕای ئەوەی ئاو دەهاتە ناو بەلەمەکە، بەردەوام بووم لە سەوڵ لێدان تاکو لە کۆتاییدا لە کەشتیەکە نزیك بوومەوە. یەکێك لە ستونی چارۆکەکانم بینی بەسەر لایەکی کەشتیەکەوە شۆڕ دەبێتەوە، کاتێك شەپۆلێکی گەورەی ئاو هات پاڵم بەخۆمەوە نا بۆ سەرەوە بۆ گەیشتن بە ستونی چارۆکەکە.

## Alone at sea

When I woke the sun was up, and I found myself about a quarter of a mile off the south west end of Treasure Island. However, the shore was very rocky and the sea rough, so I could not risk trying to go ashore.

**بەتەنها لە دەریادا**

**کاتێك خەبەرم بوویەوە خۆرەکە بەرز بوو، و خۆمم لە نزیکەی چارەکە میلێکـی دوور لـە کۆتایی ڕۆژئاوای باشوری دوورگەی گە نجینە دۆزییەوە. هەرچۆنێك بێت کەنار دەریاکـە زۆر بەردین بوو و دەریاکەش توندوتیژ بوو، ئینجا نەمتوانی هەوڵبـدەم بڕۆمـە کـەنار دەریاکە.**

I tried to paddle, but the boat was difficult to steer and water started to come in. I left horribly frightened. How could I hope to reach land?

Some time later, as I moved around the coast, I suddenly saw the ship in front of me, less than half a mile away.

**هەوڵمدا سەوڵ لێبدەم، بەڵام بەلەمەکـە زۆر زەحمـەت بـوو سـەوڵی لێبـدرێت و ئـاوی دەریاکەش دەستیکرد بە هاتنە ژوورەوە بۆناو بەلەمەکە. بەشێوەیەکی خراپ هەستم بـە ترس کرد. چۆن توانیم هیوای ئەوە بخوازم بگەمە وشکانی؟**

**پاش ماوەیـەکی دواتـر، کاتێـك بـەرەو دەوری کەنارەکـە ڕۆشـتم، لـەناکاوە کەشـتی هیسپانیۆلام بینی لە پێشمەوەیە کە کەمتر لەنیو میل دوور بوو.**

Her sails were moving freely in the wind, and it was clear to me that no one was sailing her. I thought that the two men must be asleep from the rum. If only I could get on board, I might be able to return her to her captain.

چارۆکەکانی کەشتیەکە لەهەوادا دەجولانەوە،و ئاشکرابوو بۆ من کە هیچ کەسێك کەشتیوانی کەشتیەکەی نەدەکرد. پێم وابوو کە دوو پیاوەکە دەبێت بەهۆی خواردنەوەی ڕەمەوە نووستبن. ئەگەر تەنها بمتوانیبایە بگەمە سەر کەشتیەکە، لەوانەیە بمتوانیایە کەشتیەکە بگەڕێنمەوە بۆ کاپتنەکەی (واتە بۆ سمۆلێت).

I knew what I needed to do. I sat up and started paddling again. Despite water coming into the boat, I went on paddling until at last I was close to the ship. I could see that one of the booms was hanging out over the side of the ship, and when a large wave came I pushed myself up and reached for it.

زانیم پێویستە چی بکەم. ئەخەوتم و دووبارە دەستمکرد بە سەوڵ لێدانی بەلەمەکە. سەرەڕای ئەوەی ئاو دەهاتە ناو بەلەمەکە، بەردەوام بووم لە سەوڵ لێدان تاکو لە کۆتاییدا لە کەشتیەکە نزیك بوومەوە. یەکێك لە ستونی چاروکەکانم بینی بەسەر لایەکی کەشتیەکەوە شۆڕ دەبێتەوە. کاتێك شەپۆلێکی گەورەی ئاو هات پاڵم بەخۆمەوە نا بۆ سەرەوە بۆ گەیشتن بە ستونی چارۆکەکە.

## Israel Hands

As I dropped down onto the deck, the ship came into the wind, swung and nearly threw me back into the sea. I managed to stand up, and then I saw a man lying dead further along the deck. Near him was Israel Hands, sitting against the side of the ship.

## ئیزرەیل هاندس

هەرکە کەوتمە سەر ڕووی کەشتیەکە،کەشتیەکە هاتە ناو هەواکەوەو دەخولایەوەو نزیك بوو بمخاتەوە ناو دەریاکە.توانیم هەستمە سەر پێ،وئینجا پیاوێکم بینی بە مردوویی کەوتبوو دوورتر لە سەر ڕووی کەشتیەکە.لە نزیك پیاوە مردووەکە ئیزرەیل هاندسی لێبوو کە لە پاڵ ڕوویەکی کەشتیەکە دانیشتبوو.

His eyes were closed and his face was white. I could see blood on the deck and a large cut on his leg. I thought that the two men must have killed each other. At that moment Israel moved a little and asked me to get him some brandy.

چاوەکانی ئیزەریل داخرابوون و دەمووچاوی سپی بوو.توانیم خوێن ببینم لەسەر کەشتیەکەو برینێکی گەورەشم بینی لەسەر لاقی ئیزرەیل. پێم وابوو ئەو دوو پیاوە دەبێت یەکتریان کوشتبێت.لەوکاتەدا ئیزرەیل کەمێك جوڵاو داوای لێکردم هەندێك براندی بۆ بێنم.

I quickly went down to the cabin. It looked terrible and was covered in empty bottles, but I managed to find a little brandy, as well as some biscuits , cheese and raisins for

myself. After drinking the brandy Israel was stronger and asked me where I had come from.

**بەخێرایی ڕۆشتمە خوارەوە بۆناو کابینەی کەشتیەکە.کابینەکە ترسناك دیاربوو و بە بوتڵی بەتاڵ دا پۆشرابوو،بەڵام توانیم کەمێك براندی بدۆزمەوە و هەروەها هەندێك بیسکیت و پەنیرو مێوژیش بۆ خۆم دۆزییەوە. پاش ئەوەی ئیزرەیل براندییەکەی خواردەوە،ئیزرەیل بەهێزتر بوو و پرسیاری لێکردم لە کوێوە هاتووم.**

'I have come to take the ship', I replied. 'and please think of me as your captain'. He looked at me but said nothing. Then I pulled down the pirates' black flag and threw it into the sea.

**منیش وەڵامم دایەوەو ووتم:" هاتووم بۆ بردنی کەشتیەکەو تکایە وەکو کاپتنی خۆت دامنێ".ئیزرەیل سەیری کردم و بەڵام هیچی نەووت.ئینجا ئاڵا ڕەشەکەی چەتە دەریاییەکانم ڕاکێشایە خوارەوەو فڕێمدایە ناو دەریاکەوە.**

I didn't trust Israel, but I knew that I could trust him on one point-we both wanted to beach the ship somewhere safe, where she could easily be returned to the sea. Hands offered to tell me how to do it.

**متمانەم بە ئیزرەیل هاندز نەکرد،بەڵام زانیم کە لەیەك شت متمانەی پێدەکەم-ئێمە هەردووکمان ویستمان کەشتیەکە ببەینە شوێنێکی کەنار دەریاکە بەسەلامەتی،بۆ ئەوەی کەشتیەکە لەو کەنار دەریاییەدا بتوانێت بەئاسانی بگەڕێندرێتەوە بۆ ناو دەریاکە.ئیزرەیل پێی ووتم چۆن ئەو کارە بکەم.**

So with Hands giving me step by step instructions, we brought the ship slowly into the north Inlet. Then he cried

'now my boy!' and I turned the ship quickly and she started to move towards the shore.

ئینجا لەگەڵ ئیزرەیل کە هەنگاو بە هەنگاو ڕێنمایی پێدەووتم، بەهێواشی کەشتیەکەمان هێنا بۆ باکوری کەنارە ئاوییەکەی دەریاکە. پاشان ئیزرەیل هاواریکرد و ووتی: "ئێستا کوڕم! و منیش بەخێرایی کەشتیەکەم خولانەوەو کەشتیەکەش دەستیکرد بە ڕۆشتن بەرەو کەنار دەریاکە.

While waiting for the ship to beach, I turned to face Hands. When our eyes met we both cried out. My cry was of fear, because he was now standing and had a knife in his hand. His was a cry of attack. He came towards me, but I ran to the side, pulling one of my pistols out from my belt as I moved.

لەوکاتەی چاوەڕێی گەیشتنی کەشتییەکەمان دەکرد بۆ کەنار دەریاکە، ڕووم وەرگێڕا بۆلای ئیزرەیل. کاتێك چاومان بەیەکتری کەوت هەردووکمان هاوارمان کرد. هاوارەکەی من هاواری ترس بوو، چونکە ئیزرەیل ئێستاکە وەستاوەو چەقۆیەکی بەدەستەوە بوو. هاوارەکەی ئیزرەیل هاواری هێرشکردن بوو. ئیزرەیل بەرەو ڕووم هات، بەڵام ڕامکردە لایەکی کەشتیەکەو یەکێك لە دەمانچەکانم ڕاکێشایە دەرەوە لە قایشەکەم کاتێك جوڵام.

At that moment the ship ran onto the shore and with a huge and sudden movement, fell over to one side. We both fell down onto the deck, but I jumped up again and started to climb the nearest mast. On getting high up the mast, I stopped to load my two pistols.

لەوکاتەدا کەشتیەکە بە جولەیەکی لەناکاو و گەورەوە گەیشتە کەنار دەریاکەو کەوتە سەر یەك لا .ئێمەش هەردووکمان کەوتینە سەر رووی کەشتیەکە،بەلام من دووبارە بازمدایە سەرەوەو دەستمکرد بە سەرکەوتن بەسەر نزیکترین دارە بەرزەکانی سەر کەشتیەکە .کاتێك گەیشتمە سەر دارە بەرزەکە،وەستام بۆ هەلگرتنی هەردوو دەمانچەکەم.

Hands began to come up the mast after me, and then he stopped climbing and threw his knife at me. Despite the fact that it hit me in the shoulder, I fired both my pistols. Hands cried out and fell into the water below.

ئیزرەیل دەستیکرد بە هاتنە سەر دارە بەرزەکەی کەشتیەکە لە پاش من،و ئینجا ئیزرەیل لە سەرکەوتنە سەرەوە وەستاو چەقۆکەی تێگرتم .سەرەرای ئەو راستیەش چەقۆکە دای لە شانم،منیش بە هەردوو دەمانچەکەم گولەم تەقاند.ئیزرەیل هاندز هاواریکرد و کەوتە ژێر ئاوەکەوە.

## Pieces of eight

After a few moments of fear, I saw that the knife had not hurt me much and I climbed slowly down. Hands was dead in the water. I got rid of the other body by lifting it over the side of the ship to join Hands.

## پارە ووردە ئاڵتوونیەکان

پاش چەند خولەکێکی ترس، بینیم کە چەقۆکە زیانی زۆر لێنەداوم و بەهێواشی ڕۆشتمە خوارەوە. ئیزرەیل لەناو ئاوەکە مرد بوو. مردووەکانی سەر کەشتیەکەم فڕێداوە ناو ئاوەکە بۆلای ئیزرەیل.

Before leaving the ship I pulled in as many of the sails as I could. Then I dropped down into the water and walked to the beach. I was very excited and could not wait to get back to the stockade to tell the others that I had got the ship back.

پێش ئەوەی کەشتیەکە بەجێبهێڵم تا توانیم زۆربەی چارۆکەکانی کەشتیەکەم ڕاکێشایە ناوەوە. پاشان خۆم هەڵدایە ناو ئاوەکەو بە پێ ڕۆشتم بۆ کەنار دەریاکە. زۆر خۆشحاڵ بووم و نەمتوانی چاوەڕێی ئەوە بکەم بگەڕێمەوە بۆ سەنگەرەکەو بە ئەوانی تر بڵێم کە کەشتیەکەم گەڕاندۆتەوە.

It was late at night by the time I found my way to the stockade. As I came towards the gate I was pleased to hear the sound of my friends snoring. Then, when I walked in, a strange voice suddenly cried out, 'pieces of eight! Pieces of eight! Pieces of eight!'.

It was Silver's parrot. The men woke up immediately and Silver cried, 'Who goes there?'

کاتەکە درەنگ بوو لە شەودا لەوکاتەدا ڕێگای خۆم دۆزییەوە بۆلای سەنگەرەکە. کاتێك بەرەو دەرگای سەنگەرەکە هاتم خۆشحاڵ بووم بە بیستنی پرخەی هاوەڵەکانم کە نوستبوون. ئینجا کاتێك ڕۆشتمە ژوورەوە، لەناکاو دەنگێکی نامۆ هاواریکرد و ووتی: "پارە ووردە ئاڵتوونیەکان! پارە ووردە ئاڵتوونیەکان! پارە ووردە ئاڵتوونیەکان!، ئەویش بەبەغاکەی سیلڤەر بوو. پیاوەکان ڕاستەوخۆ بەخەبەر هاتن و سیلڤەر هاواریکرد و ووتی: "ئەوە کێیە لەوێ؟

I tried to run away, but it was impossible, and they soon caught me. Silver ordered someone to go and get a torch, and I waited for the light to come.

هەوڵمدا هەڵبێم، بەڵام نەگونجاو بوو، و ئەوان بەخێرایی دەستگیریان کردم. سیلڤەر فەرمانیدا بە کەسێك بڕوات و مەشخەڵێك بهێنێت، و منیش چاوەڕێی ئەوەم دەکرد مەشخەڵەکە بهێنرێت.

## Episode 8: Captain Silver
## In the enemy's camp

'You've come to visit us, Jim' said Silver. 'That's nice'.

I said nothing but looked Silver in the face. 'Now, I've always liked you, I've', said Silver. 'You're friends won't take you back after this. And unless you're going to start a third group of men on your own, you'll have to join us'.

## زنجیرەی هەشتەم: کاپتن سیلڤەر
## لەناو کامپی دوژمندا

لۆنگ جۆن ووتی: "هاتووی بۆ سەردانی ئێمە جیم، ئەوە شتێکی جوانە".
منیش هیچم نەگووت بەڵام سەیری دەموچاوی سیلڤەرم کرد.
سیلڤەر ووتی: "ئێستاکە، من هەمیشە حەزم بەتۆ کردووە، هاوڕێکانت ناتبەنەوە لە پاش ئەم گەشتە. پێویستە پەیوەندی بە ئێمەوە بکەیت مەگەر خۆت بە تەنها دەستبکەیت بە پێکێنانی کۆمەڵی سێهەمی پیاوەکان.

So, my friends were alive. 'If I've the freedom to choose', I replied, 'I think you should tell me what's going on, and where my friends are'.

'Yesterday, Dr. Livesey came with the white flag to speak to me', explained Silver. 'He told me that the ship had gone.

منیش وەڵامم دایەوەو ووتم: "ئەگەر ئازاد بم لە هەڵبژاردنی داواکاریەکانت، پێم وایە دەبێت پێم بڵێی چی ڕووی داوەو هاوڕێکانم لە کوێن".

سیلڤەر ڕوونی کردەوەو ووتی: "دوێنێ دکتۆر لڤیسی بە ئاڵا سپییەکەوە هات بۆ قسەکردن لەگەڵ من، دکتۆر لڤیسی پێی ووتم کە کەشتییەکە ڕۆشتووە.

We didn't have any food, and so he suggested that we should make a bargain with him, and that's what we did. So here we are, with the supplies, brandy, log-house and firewood. I don't know where they are'.

ئێمەش هیچ خواردنێکمان نەبوو، و دکتۆر لڤیسی پێشنیاری ئەوەی کرد کە پێویستە ڕێکەوتنامەیەك بکەین لەگەڵ لڤیسی، و ئەوەبوو ئەو ڕێکەوتنامەیەمان کرد. کەواتە ئێمە لێرەین لەگەڵ شت و مەك و براندی و خانووە دارینەکەو دار سووتەمەنی. نازانم دکتۆر لڤیسی و هاوڕێکانی لە کوێن".

'Well', I said, 'you've got no ship, the treasure's lost, men have died and everything's gone wrong. And if you want to know who did it....it was I! I was in the apple barrel the night we first saw Treasure Island, and

منیش ووتم: "زۆرباشە، تۆ کەشتیت نیە، گەنجینەکەش ونبوەو دەریاوانەکان مردوون و هەموو شتێك بە هەڵەدا چووە. ئەگەر دەتەوێ بزانیت کێ ئەم کارانەی کردووە، ئەوە من بووم. من لەناو بەرمیلی سێوەکە بووم ئەو شەوەی یەکەمجار دوورگەی گەنجینەمان بینی، و

I heard everything you said. I cut the anchor from the ship, and killed the men on board her, and hid her somewhere where you'll never find her. Kill me if you want, or save me, I'll forget all this and support you when you are in court for piracy'.

هەموو شتێکم بیست کە تۆ گووتت.من لەنگەری کەشتیەکەم بڕی،ودەریاوانەکانی سەر کەشتیەکەم کوشت،و لە شوێنێك کەشتییەکەم شاردۆتەوە کە هەرگیز نایدۆزیتەوە. بمکوژە ئەگەر دەتەوێ یان ڕزگارم بکە.بەڵام ئەگەر ڕزگارم بکەی،ئەوە هەموو ئەمانە لەبیر دەکەم و هاوکاریت دەکەم کاتێك لە دادگا بیت بۆ دادگاییکردنت سەبارەت بە تاوانی چەتەی دەریایی".

For a moment there was silence as they all just looked at me. 'He knew Black Dog', said one man. Silver added, 'and it was this same boy who got the map from Billy Bones'.

بۆ ماوەیەك بێدەنگیەك هەبوو کاتێك هەموویان تەماشایان کردم.

یەکێك لە دەریاوانەکان ووتی:"ئەو (واتە جیم) سەگە ڕەشەکەی ناسیوە".سیلڤەریش ووتی:"هەروەها ئەمە هەمان کوڕە کە نەخشەکەی لە بیلی بەونز وەرگرتووە".

At this moment another man jumped up with a knife and said, 'then I'm going to kill him'. 'stop', said Silver. 'you aren't the captain. I like that boy-he is better than all of you, and I say he stays alive. You have chosen me to be captain. If you don't want me, you know what to do'.

لەم کاتەدا پیاوێکی تر بە چەقۆیەکەوە بازیداو ووتی:"کەواتە دەیکوژم".

سیلڤەر ووتی:"بوەستە،تۆ کاپتن نیت،من حەز بەو کوڕە دەکەم-ئەو کوڕە لە هەمووتان باشترە،ومن دەڵێم ئەو کوڕە بە زیندوویی دەمێنێتەوە.ئێوە منتان بە کاپتن هەڵبژاردووە.ئەگەر منتان ناوێت،ئەوە دەزانن چی بکەن".

After a short silence the men went outside to hold a council. The men walked out one by one, leaving Silver and me alone, and they were gone for some time. 'Jim', said Silver quietly, 'you could die now. We're in a lot of trouble

but I'll do my best. If I can, I'll save your life. But, see Jim, then you have to save me from being hanged'.

**پاش بێدەنگییەکی کەم پیاوەکان ڕۆشتنە دەرەوە بۆ ئەوەی کۆبوونەوەیەك بکەن. پیاوەکان یەکە بەیەکە ڕۆشتنە دەرەوەو من و سیلڤەریان بە تەنها جێهێشت، دەریاوانەکان بۆ ماوەیەك ڕۆشتن.**

**سیلڤەر بەهێمنییەوە ووتی: "جیم، تۆ دەبێت ئێستا بمریت، ئێمە لەناو کێشەیەکی زۆرداین، بەلام باشترین هەوڵی خۆم دەدەم. ئەگەر بتوانم ئەوە ژیانت ڕزگار دەکەم. بەلام دەبینیت جیم، تۆش دەبێت ڕزگارم بکەیت لە سێدارەدان".**

I thought for a moment and then promised that I would do what I could for him. 'And there's something else, Jim. The doctor has given me the treasure map. Why do you think he did that?'

My mouth fell open, which showed Silver that he did not need to ask more questions.

**بۆماوەیەکی کەم بیرم کردەوە ئینجا پە یما نمدا ئەوەی بتوانم دەیکەم بۆ سیلڤەر.**

**سیلڤەر ووتی: "جیم شتێکی تر هەیە، دکتۆر لڤیسی نەخشەی گە نجینەکەی پێدام. پێت وایە بۆچی دکتۆر لڤیسی وایکرد؟**

**دەمم کرایەوە (واتە تووشی سەرسوڕمان بووم) کە پیشانیدا پێویست ناکات سیلڤەر پرسیاری زیاتر بکات.**

**The black spot again**

The door opened, and the five men came back inside. One of them walked towards Silver nervously, and gave him a piece of paper marked with a black spot. I remembered the captain's fear of 'the black spot' long before, back at The Admiral Benbow.

**دووباره خاڵه ڕەشەکە**

دەرگاکە کراوەو پێنج پیاو گەڕانەوە ژوور. یەکێکیان بەتوڕەییەوە بەرەو ڕووی سیلڤەر ڕۆشت و پارچە کاغەزێکی بەخشی بە سیلڤەر کە بە هێمایەکی ڕەش دیاریکرابوو. منیش ترسی کاپتن بیلی بەونزم بیرکەوتەوە کە لە هێما ڕەشەکە ترسا ماوەیەك زۆر لەمەوپێش لە خانەی ئەدمیراڵ بێنبەو.

Silver turned over the small dark piece of paper and then said, 'Well, what does it say? 'Deposed' well, I'm still your captain until you tell me why you're unhappy, and I reply. After that we'll see'.

سیلڤەر پارچە کاغەزە بچوکەکەی وەرگێرا ئەودیو و ووتی: "زۆرباشە، ئەم کاغەزە چی دەڵێت؟لەکارخستن" زۆرباشە من هێشتا کاپتنی ئێوەم تاکو پێم دەڵێن بۆچی دڵخۆش نین، ومنیش وەڵامتان دەدەمەوە. پاش ئەوە دەبینین چی دەبێت".

'Well, first', replied one of the men, called George Merry, 'you've made a mess of this voyage. Second you let the enemy out of here for nothing. Why did they want out? I don't know, but I know that's they wanted. Third you wouldn't let us shoot as they were leaving. And finally, there's this boy'.

**یەکێك لە پیاوەکان کەناوی جۆرج مێری بوو ووتی؛"زۆرباشە،تۆ ئەم گەشتەت پیسکردووە (واتە تێکت داوە).دووەم،تۆ ڕێگە بەڕۆشتنە دەرەوەی دوژمن دەدەیت لێرە بەخۆڕایی و لە پێناوی هیچ.بۆچی ئەو دوژمنانە ویستیان لێرە بڕۆنە دەرەوە؟نازانم بەلام دەزانم کە ئەو دوژمنانە چیان ویست.سێهەم،تۆ ڕێگەت پێنەداین گولە بتەقێنین کاتێك ئەو دوژمنانە ئێرەیان جێهێشت.هەروەها لەکۆتاییشدا ئەم کوڕە لێرەیە".**

'I made a mess of this voyage, did I? asked Silver quietly. 'you all know that I didn't want to attack them until the treasure had been found and we were on our way back to England. If you would listened to me, we'd all still be on the ship.

**سیلڤەر بەهێمنییەوە پرسیاریکرد:"من ئەم گەشتەم تێکداوە،ئایا من بووم؟هەمووتان دەزانن کە من نەمویست هێرش بکەمە سەریان تاکو گەنجینەکە دەدۆزرێتەوەو بەڕێگاوە دەبین بۆ ئینگلاند (بریتانیا).ئەگەر گوێتان لە من بگرتایە،ئەوە هێشتا هەموومان لەسەر کەشتیەکە دەبووین.**

Everyone of us would be alive and there'd be food and drink and the treasure on board! But you men wouldn't do what I told you. Because of what you have done, we could all hang! And isn't this boy a hostage? He might be our last chance. Kill that boy? I wouldn't.

**هەر یەکێك لە ئێمە زیندوو دەبوو،و خواردن و خواردنەوەو گەنجینەش لەسەر کەشتیەکە دەبوو! بەلام ئێوەی پیاو ئەوەی من پێم ووتن ئەنجامتان نەدا.بەهۆی ئەوەی ئەنجامتاندا،دەبێت هەموومان لەسێدارە بدرێین!و ئایا ئەم کوڕە بارمتە نیە؟ئەم کوڕە لەوانەیە کۆتا دەرفەتی ئێمە بێت.ئەو کوڕە بکوژین؟من نایکوژم.**

second the doctor comes here every day to look after that big cut on your head, John, and give you medicine George. And there's another ship coming, and it's not so long until then. We'll see who'll be glad to have a hostage when that time comes.

دووەم، دکتۆر لڤیسی هەموو ڕۆژێك دەهاتە ئێرە بۆ چاودێریکردنی (تیمارکردنی) برینە گەورەکەی سەرت جۆن، هەروەها لڤیسی دەرمانی دەدا بە تۆ جۆرج. هەروەها کەشتیەکی تر دێت کە زۆری پێناچێت. ئەوکاتە دەبینین کێ خۆشحاڵ دەبێت بەوەی بارمتەی هەبێت کاتێك ئەو کاتە دێت.

Third, you asked me to bargain. And if I hadn't made a bargain, we'd all have starved. And this is why I did it', he shouted, and he threw a paper down in front of him.

سێهەم ئێوە داواتان لە من کرد ڕێکەوتنامە بکەم لەگەڵ دوژمنان. ئەگەر ڕێکەوتنامەم نەکردایە، ئەوە هەموومان لە برسا دەمردین. هەورها ئەمە ئەوەیە کە ئەنجامەدا، سیلڤەر هاواریکرد و کاغەزێکی فڕێدایە بەردەم پیاوەکە.

It was the treasure map, complete with the three red crosses. The mutineers jumped on the map like five cats on a mouse. Soon, however, Merry said, 'This is all very good-but how are we going to get away without a ship?'

ئەو کاغەزە نەخشەی گەنجینەکە بوو کە تەواوی سێ هێڵە سوورەکەی تێدابوو. یاخیبووەکان هەڵیانکووتایە سەر نەخشەکە وەکو پێنج پشیلە بۆ سەر مشکێك.

جۆرج میری ووتی: "هەرچۆنێك بێت ئەمە هەمووی زۆرباشە-بەڵام چۆن بەبێ کەشتی دوور بکەوینەوە لێرە؟

'You and the other men lost us the ship', said Silver angrily, 'and I got us the treasure. Who's the better man? I've had enough. Choose yourselves another captain'.

'Silver!' they cried, 'Silver forever!'

سیلڤەر بە توورەییەوە ووتی: "تۆ و پیاوەکانی تر کەشتیەکەتان لێوونکردین، و من گە نجینەکەم بۆ بەدەست دەهێنان. کێ باشترە؟ من بە پێی پێویست کاری باشم کردووە. خۆتان کاپتنێکی تر هەڵبژێرن".

هەموو دەریاوانەکان هاواریان کرد و ووتیان: "سیلڤەر، سیلڤەر بۆ هەتا هەتایە!

**The doctor's visit**

The next morning, I was woken by someone shouting, 'Here's the doctor'. As the doctor came near, Silver said, 'We've got quite a surprise for you, sir'.

**سەردانەکەی دکتۆر لڤیسی**

بەیانی دواتر، بە هاوارکردنی کەسێك خەبەرم بوویەوەو هاواریکرد، دکتۆر لڤیسی لێرەیە". کاتێك دکتۆر نزیك بوویەوە، سیلڤەر ووتی: "بەڕێز تاڕادەیەك بەتۆ سەرسام بووین".

As the doctor came into the log-house he nodded his head towards me and then started to look after the two sick men. When he had finished, he asked to speak to me before he left.

کاتێك دکتۆر لڤیسی هاتە ژوورەوە بۆناو خانووە دارینەکە، سەری لەقاند بەرامبەرم و ئینجا دەستیکرد بە چاودێریکردنی (تیمارکردنی) دوو پیاوە نەخۆشەکە. کاتێك دکتۆر تەواو بوو لە چارەسەرکردنەکەی، داوای کرد قسەم لەگەڵ بکات پێش ئەوەی بڕوات.

'Hawkins', said Silver, 'do you give me your word that you won't run away?' I promised that I would not, and he agreed to let me go outside to talk with the doctor. He told the doctor to go and wait for me down by the fence.

سیلڤەر ووتی: "جیم هوکنس، پەیمانم پێدەدەیت کە ڕاناکەیت؟. منیش پەیمانمدا کە هەڵنایەم، و سیلڤەریش ڕێگەی پێدام بڕۆمە دەرەوە لەگەڵ لڤیسی قسە بکەم. سیلڤەر بە دکتۆری ووت بڕوات لە خوارەوەی پەرژینەکە چاوەڕێم بکات.

The other men were very angry and argued against it, but we walked down to meet the doctor. Silver said to him, 'I saved the boy's life, and was nearly deposed for it, too-he'll tell you so. So surely you'll have a good word to say about me? I'll be honest-I don't want to be hanged'. Then he left us and walked some distance away.

پیاوەکانی تر زۆر توورە بوون و دژی ئەم قسەکردنەی من و لڤیسی مناقشەیان کرد، بەلام من و سیلڤەر ڕۆشتینە خوارەوەی پەرژینەکە بۆ بینینی دکتۆر لڤیسی. سیلڤەر بە دکتۆری ووت: "من ژیانی ئەم کوڕەم ڕزگار کرد، و نزیك بوو لەکار بخرێم بەهۆی ئەم کارەوە-جیم ئەوانی ترت پێدەڵێت. کەواتە بەدڵنیاییەوە جیم قسەی باش دەڵێی سەبارەت بە من لەلای دکتۆر؟ من ڕاستگۆ دەبم-نامەوێت لەسێدارە بدرێم". پاشان سیلڤەر بەجێمانی هێشت و کەمێك دوور کەوتەوە.

'Jim', said the doctor, 'you waited until Smollett was ill and could do nothing, and then you ran away. That was very cowardly'.

'Doctor' I said. I'm very sorry, and I think I'm going to die anyway. I would have been dead by now if Silver hadn't saved me'.

دکتۆر لڤیسی ووتی: "جیم، تۆ چاوەڕێت کرد تاکو کاپتن سمۆلێت نەخۆش کەوت و نەیتوانی هیچ بکات، و ئینجا هەڵهاتیت. ئەوە کارێکی زۆر ترسنۆکانە (نامەردانە) بوو".

منیش ووتم: "دکتۆر، زۆر داوای لێبوردن دەکەم، و بەهەرحاڵ پێم وایە دەمرم. من ئێستا مردبووم ئەگەر سیلڤەر ڕزگاری نەکردایەم".

'Then quick', he replied, 'let's run away. One jump and you are out!'

'No', I answered, 'I gave my word and I must stay. But I'll tell you one thing in case I do die. I've got the ship, partly by luck and partly by risking my life. She lies in the north Inlet'.

**دکتۆر لڤیسی وەڵامی دایەوەو ووتی: "کەواتە خێراکە، با هەڵبێین. یەك بازدان لە دەرەوە دەبیت".**

**منیش وەڵامم دایەوەو ووتم: "نەخێر، پەیمانم داوەو پێویستە بمێنمەوە. بەڵام یەك شتت پێدەڵێم ئەگەر مردم، کەشتیەکەم هێناوەتەوە، تارادەیەك بە بەخت و ژیانم کەوتە مەترسیەوە. کەشتیەکە لە کەنارە ئاوییەکەی باکورە".**

'The ship!' said the doctor. I then quickly explained everything that had happened. 'At every step', he answered, 'it has been you who has saved our lives. We won't now let you lose yours. And finding Ben Gunn was the best thing you've ever done'.

**دکتۆر ووتی: "کەشتیەکە". منیش خێرا هەموو شتێکم ڕوونکردەوە کە ڕوویدابوو.**
**دکتۆر ووتی: "لە هەموو هەنگاوێکدا تۆ بووی کە ژیانی ئێمەت ڕزگار کردووە. ئێستاکە ڕێگات پێنادەین خۆت لەدەست بدەیت. هەروەها دۆزینەوەی بێن گەن باشترین شت بوو کە تا ئێستا ئەنجامت دابێت".**

Then he called to Silver. 'Silver', he said, 'I'll give you some advice. Don't be in a hurry to get that treasure. And when you find it, expect trouble'.

**پاشان دکتۆر بانگی سیلڤەری کردو ووتی: "سیلڤەر، هەندێك ئامۆژگاریت دەکەم. پەلە مەکە لە بەدەستهێنانی ئەو گەنجینەیە، و کاتێك دۆزیتەوە، ئەوە چاوەڕوانی کێشە بکە".**

Silver asked him what he meant by that, but the doctor said, 'I can't say more. It's not my secret. If we get out of here alive, I'll do my best to save you. And another thing-keep the boy close to you, and when you need help, shout'.

سیلڤەر پرسیاریکرد لە دکتۆر کە مەبەستی چی بوو لەو قسانە، بەلام دکتۆر ووتی: "ناتوانم زیاتر بلێم، ئەوە نهێنی من نیە، ئەگەر لێرە بەزیندوویی دەربچین، ئەوە باشترین هەولی خۆم دەدەم بۆ ڕزگارکردنت. وە شتێکی تریش جیم هۆکنس لەخۆت نزیك بکەرەوەو کاتێك پێویستت بە یارمەتی بوو ئەوە هاوار بکە". (واتە بانگی جیم بکە)

**The search for the treasure**

I didn't trust Silver. It was with a heavy heart that I, tied to a length of rope that Silver was holding, followed the men when they went up the hill to look for the bulk of the treasure near Spy-glass hill.

**گەڕان بەدوای گە نجینەکە**

متمانەم بە سیلڤەر نەکرد، بەدڵێکی قورسەوە خۆم توند کرد بە گوریسێکی درێژ کە سیلڤەر گرتبووی، وبەدوایدا پیاوەکان شوێنی سیلڤەر کەوتن، کاتێك ڕۆشتنە سەر گردەکە بۆ گەڕان بەدوای زۆرترین بەشی گە نجینەکە لەنزیك گردی سپای گلاس (تەلیسکۆپ).

The men were all carrying several weapons each, and some were also carrying shovels, pickaxes and food supplies. The men followed the detailed instructions on the back of the treasure map. We crossed swamp and woodland and then climbed up towards the flat top of the Spy-glass.

هەموو پیاوەکان هەردانەیەکیان هەندێك چەکیان هەڵگرتبوو، وهەندێکیشیان بێڵ و قولنگ و خواردەمەنیان هەڵگرتبوو. پیاوەکان بەدوای ڕێنماییە وردەکارییەکان دەکەوتن لە سەر پشتەوەی نەخشەی گە نجینەکە. زەلکاو و دارستانەکەمان تێپەڕاند و ئینجا سەرکەوتین بەسەر لوتکە تەختەکەی گردی سپای گلاس.

One of the men in front suddenly screamed out in fear. Near a tree he had found a skeleton, lying unnaturally straight with its arms pointing up above its head. Silver thought for a moment and then asked one of the men to take a compass

bearing. The body pointed from Skeleton Island to Spy-glass hill.

**یەکێك لە پیاوەکان لە پێشەوە لەناکاوە لەترسا قیژاندی.لەنزیك دارێکەوە ئەو پیاوەی کە قیژاندی ئێسکە پەیکەرێکی دۆزییەوە کە بەشێوەیەکی ناسروشتی ڕاست کەوتبوو،و دەستەکانی بۆ سەرەوە درێژ کردبوو لەسەر سەرییەوە.سیلڤەر بۆ ماوەیەکی کەم بیری کردەوەو ئینجا داوای لە یەکێك لە پیاوەکان کرد ئاراستەیەك بگرن.لاشەکە لە دوورگەی ئێسکە پەیکەرەوە بۆ گردی سپای گلاس ئاماژەی کردبوو.**

'I thought so', cried the sea-cook, 'Flint killed this sailor and left his body here as a pointer to the treasure! What a terrible man that Flint'.

The men were much quieter after that, and they walked closer together.

**چێشتلێنەرە دەریاییەکە هاواریکرد و ووتی: "منیش هەمان بیرکردنەوەم بوو،فلنت ئەم دەریاوانەی کوشتووەو بەجێیهێشتووە لێرە وەکو هێمایەك بۆ گە نجینەکە! ئەو فلنتە چ پیاوێکی ترسناك بووە".**

**پاش ئەوە پیاوەکان زیاتر هێمنتر بوون،و پێکەوە لەیەك نزیکتر ڕۆشتن.**

All of a sudden from the trees in front of us, came a thin high voice, singing the words we knew well:

'Fifteen men on the dead man's chest-

Yo-ho-ho, and a bottle of rum!

**لەناکاوە لە دارەکانی پێشەوەماندا دەنگێکی ناسکی بەرز هات کە ئەو ووشانەی بە گۆرانییەوە دەووت کە هەمووومان دەمانزانی:**

***پانزە پیاو لەسەر سنگی پیاوە مردووەکە-***

***یۆ-هۆ-هۆ،و بوتڵێکی ڕەم!***

I have never seen men before more frightened than those pirates. 'It's Flint's ghost!' cried one of them. But Silver spoke up, 'shipmates', he cried, 'I'm going to get that treasure and no man will stop me whether he's dead or alive'.

**هەرگیز پیاوی ترساوم نەبینیبوو لەچاو ئەو چەتە دەریاییانەدا. یەکێك لە چەتەکان هاواریکرد و ووتی: "ئەوە ڕوحەکەی فلنتە!".**
**بەڵام سیلڤەر قسەی کرد و هاواریکرد: "هاورێ دەریاوانەکان، من ئەو گە نجینەیە بەدەستدێنم و هیچ پیاوێك ناموەستێنێت ئەگەر مردوو بێت یان زیندوو".**

After a few words from Silver, the men agreed to go on. And we looked for the tall tree marked on the map, where the treasure lay buried. They now walked faster and Silver was full of excitement.

**پاش چەند قسەیەك لەلایەن سیلڤەرەوە، پیاوەکان ڕازیبوون بەردەوام بن لە دۆزینەوەی گە نجینەکە. هەروەها بەدوای دارە بەرزەکە گەڕاین کە لەنەخشەکە دیاریکرابوو، کە لە شوێنی دارەکەدا گە نجینەکە حەشاردرابوو. ئەوان ئێستا خێراتر ڕۆشتن و سیلڤەریش زۆر دڵخۆش بوو.**

I knew that all Silver wanted was the treasure, and to get away from the island, and that he would kill anyone who stood in his way. As we came near the great tree the men began to run, and then they stopped suddenly. In front of us was a great hole, not recently made, and very little else. The treasure that lay under the first of the red crosses on the map had been found and taken!

زانیم کە هەموو ئەوەی سیلڤەر ویستی گە نجینەکە بوو، و دوور بکەوێتەوە لە دوورگەکە، و هەرکەسێك بکوژێت کە ڕێگەی لێبگرێت. هەرکە نزیك دارە گەورەکە بووینەوە پیاوەکان دەستیان کرد بە ڕاکردن، و ئینجا لەناکاوە وەستان. لە بەردەماندا کونێکی گەورە هەبوو کە بەم نزیکانە دروست نەکرابوو، و کونی زۆر بچوکی تریش هەبوو. گە نجینەکە کە لەژێر یەکەم هێڵە سوورەکان دانرابوو لەسەر نەخشەکە دۆزرابوویەوەو برابوو.

## The end of the fight

The pirates swearing and shouting, jumped into the hole and started to dig with their hands. One finally found a single piece of gold. In the meantime, Silver had recovered quickly from the shock.

## کۆتایی شەڕەکە

چەتەکان جنێویان دەداو هاواریان دەکرد، بازیاندایە ناو کونەکەو دەستیان کرد بە هەڵکەندنی کونەکە بەدەستیان. لەکۆتاییدا یەکێکیان یەك پارچە ئاڵتونی دۆزییەوە. لەوکاتەدا سیلڤەر بەخێرایی لە شۆکەکەی چاکبویەوە.

He quietly passed me a pistol and whispering in a friendly way, 'Jim, take that. And be ready for trouble'. He had changed sides again. Then taking me with him, he moved slowly to the other side of the hole. The pirates, finding nothing more, climbed out of the hole opposite us.

سیلڤەر بەهێمنییەوە دەمانچەیەکی پێدام و بەشێوەیەکی هاوڕێیانە چپەی بۆ کردم و ووتی: "جیم ئەو دەمانچەیە ببە. و ئامادەی کێشە ببە". سیلڤەر دووبارە لاکانی گۆڕی لەگەڵ خۆی بردمی، وبەهێواشی بەرەو لایەکەی تری کونەکە ڕۆشت. چەتەکان هیچ شتێکی زیاتریان نەدۆزییەوەو لە کونەکە سەرکەوتنە سەرەوە بەرامبەرمان.

George Merry shouted at Silver, 'that's the treasure, is it? He turned and spoke to the other four pirates, 'Now, mates. I say we kill them...'

At that moment there came the sound of muskets firing and Merry fell into the hole, another dropped down dead and the remaining three men ran away.

جۆرج میری هاواریکرد بەسەر سیلڤەر و ووتی: "ئەوە گە نجینەکەیە وایە؟ جۆرج ئاوڕی دایەوەو قسەی بۆ چوار چەتەکەی تر کرد و ووتی: "ئێستاکە هاوڕێیان دەڵێم سیلڤەر بکوژین".

لەوکاتەدا دەنگی تەقاندنی چەکەکان هات و جۆرج میری کەوتە ناو کونەکەوەو چەتەیەکی تریش بە مردوویی کەوتە سەر زەوی و سێ چەتەکەی تریش کە مابوونەوە هەڵهاتن.

In a moment Silver had shot George Merry again and killed him. The doctor, Gray and Ben Gunn then came out of the trees to join us. As we walked down to the boats, the doctor told us what had happened.

هەرزوو سیلڤەر دووبارە تەقەی کرد لە جۆرج و کوشتی. دکتۆر لڤیسی و ئیبراهیم گرەی و بین گەن لەناو دارەکانەوە هاتنە دەرەوەو پەیوەندیان پێوە کردین. کاتێك رۆشتینە خوارەوە بۆناو بەلەمەکان، دکتۆر پێی ووتین کە چی روویدابوو.

Benn Gunn during his long time on the island, had found the skeleton, and then the treasure. He had dug it up, and carried it, load after load on his back, to a cave he had found on the other side of the island.

بین گەن بەدرێژایی ماوە درێژەکەی لە دوورگەکەدا ئێسکە پەیکەرەکەی دۆزیبوویەوەو ئینجا گە نجینەکەشی دۆزیبوویەوە. بێن گە نجینەکەی لە چاڵ دەرهێنابوو، و گواستبوویەوەو بار بە بار بە پشتی باریکردبوو بۆ ئەشکەوتەکە کە لەلایەکەی تری دوورگەکە دۆزیبوویەوە.

When the doctor had heard this, and had seen that the ship had gone, he realized that the map was useless. He went to Silver and gave him the map, and the supplies,

because he knew that the best place to be was in the secret cave, with the treasure and Benn Gunn's food supplies.

کاتێك دکتۆر نەمەی بیست، و بینیبووی کەشتیەکە ڕۆشتووە، دەرکی پەودکردبوو کە نەخشەی گەنجینەکە بێسوود بووە. دکتۆر ڕۆشتووە بۆلای سیلڤەرو نەخشەکەو شت و مەکەکانی پێبەخشیوە، چونکە دکتۆر زانی کە باشترین شوێن تیایدا بێت بریتیە لە ئەشکەوتە نهێنییەکە لەگەڵ گەنجینەکەو خواردەمەنییەکانی بێن گەن.

When Dr. Livesey saw that I was with the mutineers, he had run as fast as he could to be ready at the hole with Benn Gunn. When we got to the boats, the doctor used a pickaxe to break up one boat, and then we all climbed into the other and started to row the eight or nine miles to North Inlet.

کاتێك دکتۆر لڤیسی بینی کە لەگەڵ یاخیبووەکانم، تا توانی بەخێرایی ڕایکرد بۆ ئەوەی ئامادە بێت لەلای کونە گەورەکە لەگەڵ بێن گەندا. کاتێك گەیشتینە لای بەلەمەکان، دکتۆر لڤیسی قولنگێکی بەکارهێنا بۆ شکاندنی یەك بەلەم، وئینجا هەموومان سەرکەوتینە ناو بەلەمەکەی ترو دەستمانکرد بەسەوڵ لێدان هەشت یان نۆ میلمان بەرەو کەنارە ئاوییەکەی باکور بڕی.

As we got close, we came round a hill and saw the black mouth of Benn Gunn's secret cave. The squire was standing there, looking after the treasure. He did not look pleased to see Silver.

کاتێك نزیك بووینەوە، هاتینە دەوری گردێك و دەمە ڕەشەکەی ئەشکەوتە نهێنییەکەی بێن گەنمان بینی. تریلۆنی لەوێ وەستابوو، و چاودێری گەنجینەکەی دەکرد. تریلۆنی خۆشحاڵ دەرنەکەوت بە بینینی سیلڤەر.

We found Captain Smollett lying by a fire inside the cave, and behind him I could see a very large pile of gold coins.

So this was Flint's treasure. How much pain, sadness and blood had cost, and how many ships had been sunk, cannons shot and lies told no one could say.

کاپتن سمۆلێتمان دۆزییەوە کە لەتەنیشت ئاگرێکەوە پاڵکەوتووە لەناو ئەشکەوتەکە، ولە پشتی سمۆلێتەوە توانیم کۆمەڵێکی گەورەی پارەی ووردەی ئاڵتون ببینم. کەواتە ئەمە گەنجینەکەی فلنت بوو. چەند ئازارو خەمباری و خوێنی تێچووە، و چەند کەشتی نوقمی ئاوبووە لە پێناوی ئەم گەنجینەیە، و چەند تۆپ تەقێنراوەو چەند درۆ کراوە کە کەس نەیتوانیوە بیڵێت.

That night I ate a wonderful meal with all my friends around me. We ate Ben Gunn's salted goat, and had some wine from the ship. And there was Silver, sitting and laughing with us-the same friendly hopeful smiling sea-cook we had left Bristol with.

ئەو شەوە ژەمێکی خواردنی خۆشم خوارد لەگەڵ هەموو هاوڕێکانی دەوروبەرم. گۆشتە سوێردکەی بزنەکەی بین گە نمان خوارد، و هەندێ مەیمان خواردەوە کە لە کەشتی هیسپانیۆلا هێنامان. هەروەها لەوێدا سیلڤەر لەگەڵمان دانیشتبوو و پێدەکەنی-کە هەمان چێشتلێنەری دەریایی دەم بەخەندەو یارمەتیدەرو دۆستانەبوو کە لەگەڵیدا بریستۆڵمان جێهێشت.

## The return home

The next morning we started work moving the treasure to the ship. It was hard work, and one of us had to start with a gun on the hill to watch for the last three mutineers.

## گەڕانەوە بۆ نیشتمان

بەیانی دواتر دەستمانکرد بە ئیشکردن و گە نجینەکەمان برد بۆناو کەشتیەکە. ئیشێکی قورس بوو، و یەکێکمان پێویست بوو بە دەمانچەیەکەوە لەسەر گردەکە بوەستێت بۆ چاودێریکردنی سێ یاخیبوودکەی تر کە مابوونەوە.

Day after day this work went on. We heard the remaining mutineers once only-singing and shouting in the distance. We decided that we must leave them on the island. We left enough powder and shot, most of the goat meat, some medicines and other useful things.

ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم ئیشە بەردەوام بوو. تەنها جارێکیان گوێمان لە یاخیبووەکان بوو کە مابوونەوەو گۆرانیان دەووت و هاواریان دەکرد لە دوورەوە. بڕیارماندا کە پێویستە بەجێیان بهێڵین لە دوورگەکە. باروت و گولەی پێویست و زۆربەی گۆشتی بزنەکەو هەندێ دەرمان و شتی بەسوودی ترمان بۆ بەجێهێشتن.

Then we prepared the ship, pulled up the anchor and started to move out of North Inlet. The three men must have been watching us more carefully than we thought. As we came out of the inlet, they were on the beach.

ئینجا کەشتیەکەمان ئامادەکرد و لەنگەری کەشتیەکەمان ڕاکێشا سەرەوەو دەستمانکرد بە دەرچوون لە کەنارە ئاوییەکەی باکور. سێ یاخیبوودکە دەبێت تەماشای ئێمەیان

کردبێت زۆر بە وریاییەوە لەچاو ئەوەی ئێمە بیرمان لێکردبوویەوە.کاتێك لە کەنارە ئاوییەکە هاتینە دەرەوە،یاخیبووەکان لەسەر کەنارەکە بوون.

They were on their knees and were calling out to us, asking to be saved. The doctor shouted to them and told them where they could find the supplies we had left. But they continued to shout and then one of them fired a shot.

یاخیبووەکان لەسەر ئەژنۆکانیان کەوتبوون و هاواریان بۆ دەکردین و داوایان دەکرد ڕزگار بکرێن.دکتۆر لڤسی هاواری بۆ کردن و پێی ووتن کە لە کەنارەکەدا دەتوانن شت و مەکەکان بدۆزنەوە کە بەجێیان هێشتووە.بەلام یاخیبووەکان بەردەوام بوون لە هاوارکردن،وئینجا یەکێکیان گولەیەکی تەقاند.

Slowly, they disappeared from sight, and by midday the highest rock of Treasure Island had grown small and sunk into the blue sea.

The sun was just sinking down into the water when we dropped our anchor in a beautiful Mexican bay.

بەهێواشی یاخیبووەکان لەچاو دیارنەمان و لەنیوەڕۆدا بەرزترین بەردی دوورگەی گەنجینە بچوك بوویەوە لە پێش چاو و لەناو دەریا شینەکە نوقم بوو لە پێش چاو. خۆرەکەش نوقم دەبووە ناو ئاوەکە کاتێك کەشتیەکەمان لەنگەری گرت لە کەنداوێکی مەکسیکی جوان.

Many small boats came out to us, full of people selling many different types of colourful fruit and vegetables. The sight of so many smiling faces, the taste of such amazing fruit and the lights that had begun to shine in the town were a wonderful change from our dark and dangerous time on the island.

**زۆر بەلەمی بچوك بۆلامان هاتن کە پڕ بوون لە خەڵکی و زۆر جۆری جیاوازی میوەو سەوزەی ڕەنگاوڕەنگیان دەفرۆشت. دیمەنی زۆر دەموچاوی بەخەندەوە، و بۆنی میوەی سەرنجڕاکێش (سەرسوڕمان) و ئەو ڕووناکیانەی دەستیان کردبوو بە بریسکانەوە لەناو شارۆچکەکە هەموو ئەمانە گۆڕانێکی سەرنجڕاکێش بوون لە کاتە تاریك و ترسناکەکەمان لە دوورگەکەدا.**

The doctor and the squire decided to go ashore for the evening and they took me with them. When we returned, Silver had gone and had taken one of the bags of coins with him. I think we were all pleased that we had got rid of him so cheaply.

**دکتۆر لڤیسی و تریلۆنی بڕیاریاندا بڕۆن بۆ کەنار دەریا بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە، و منیشیان لەگەڵ خۆیان برد. کاتێك گەڕاینەوە سیلڤەر ڕۆشتبوو، و یەکێك لە جانتا پارە وورده ئاڵتوونیەکانی بردبوو لەگەڵ خۆی. پێم وایە هەموومان دڵخۆش بووین کە زۆر بەئاسانی سیلڤەرمان لابرد (ڕزگارمان بوو لەدەستی).**

To cut a long story short, we found a few more sailors, had a good voyage home, and the Hispaniola reached Bristol in the late summer. Only five men who had sailed from Bristol returned with the ship.

**بۆ کورتکردنەوەی چیرۆکە درێژەکە، چەند دەریاوانێکی کەممان دۆزییەوە کە گەشتێکی دەریایی خۆشمان کرد بۆماڵەوە، و کەشتی هیسپانیۆلا گەیشتە بریستۆل لە کاتێکی درەنگی ودرزی هاوین. تەنها پێنج پیاو کە دەریاوانیان کردبوو لە بریستۆلەوە لەگەڵ کەشتیەکە گەڕانەوە."**

'Drink and the devil had done for the rest', though we were not in as bad a situation as the other ship they had sung about:

'With one man of her crew alive,
What put to sea with seventy five'.

بخۆنەوەو بەدکارەکە ئەوانی تری کوشت"، هەرچەندە ئێمە لە بارودۆخێکی خراپ نەبووین وەك کەشتیەکانی تر کە گۆرانیان لەباردیەوە دەووت. :

*یەکێك لە دەستە دەریاوانەکانی (کەشتیەکە) زیندووە (واتە ڕزگاری بوو)*
*کە بە حەفتاو حەوت دانەوە لە دەریا بوو*

We all had a good share of the treasure and we used it well or badly, depending on the person. Captain Smollett has now retired from the sea. Gray saved his money and studied to be a ship's mate. He also got married and had children.

هەمووما‌ن بەشێکی باشی گە نجینەکەمان بەرکەوت، و بەباشی یان بەخراپی گە نجینەکەمان بەکارهێنا، ئەمەیان پشتی بەستبوو بە کەسەکە کە چۆن بەکاری هێناوە. کاپتن سمۆلێت ئێستاکە خانەنشین بوو لە دەریاوانی. گرەی پارەکەی پاشەکەوت کرد و خوێندی بۆ ئەوەی ببێت بە دەریاوان. گرەی هەروەها ژیانی هاوسەرێتی پێکهێنا و چوار منالی هەبوو.

Ben Gunn got a thousand pounds which he spent or lost in nineteen days. Then he went to live in a village where he still sings in church every Sunday.

بین گەن هەزار پاوەندی دەستکەوت کە سەرفیکرد یان لەدەستیدا لەماوەی نۆزدە ڕۆژدا. پاشان بین ڕۆشت بۆ لادێیەك بژی کە لەوێدا هێشتا هەموو یەك شەممەیەك گۆرانی دەڵێت لە کەنیسە.

We heard no more about Silver. That terrible seaman with one leg at last gone out of my life. I hope he is somewhere living happily in this world, because I am sure he will not be happy in the next.

دەربارەی سیلڤەر هیچی زیاترمان نەبیست. ئەو دەریاوانە ترسناکە کە یەک قاچی بوو لەکۆتاییدا لە ژیانم ڕۆشتە دەرەوە (واتە ڕزگارم بوو لە سیلڤەر). هیوادارم سیلڤەر لە شوێنێک بژیت بە دڵخۆشیەوە لەم جیهانە، چونکە دڵنیام لە جیهانەکەی تر دڵخۆش نابێت.

The silver and the weapons still lie buried, for all I know, where Flint hid them. But I will never go back to that island, and the worst dreams I ever have are when I see that terrible rocky coast, or when I suddenly sit up in my bed with the hard voice of Captain Flint still loud in my ears, screaming, 'pieces of eight! Pieces of eight!'

زیوەکەو چەکەکان هێشتا لەژێر خاکدان. هەموو ئەوەی دەیزانم دەربارەی مەسەلەکە ئەو شوێنەیە کە فلنت گە نجینەکەی تیادا شاردۆتەوە. بەڵام هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ ئەو دوورگە، وخراپترین خەونەکان کە تائێستا دەیبینم ئەو خەونانەیە کاتێک ئەو کەنارە دەریاییە تاوێرینە ترسناکە دەبینم، یان کاتێک لەناکاوە لەناو جێگەی نوستنەکەم دێمە خەبەرو دادەنیشم بەهۆی دەنگە ڕەقەکەی کاپتن فلنت کە هێشتا لەناو گوێیەکانم بە دەنگی بەرز دەقیژێنێت، و دەڵێت: "پارە ووردە ئاڵتوونیەکان! پارە ووردە ئاڵتوونیەکان!".

# Treasure Island




خوێنەرانی خۆشەویست ئەم وەرگێڕانە سوودێکی زۆری هەیە بۆ ئەو خوێنەرانەی کە دەیانەوێت فێری زمانی ئینگلیزی ببن,چونکە خوێندنەوە یەکێکە لەڕێگا سەرکەوتووەکانی فێربوونی زمان.بەخوێندنەوەی تێکستە کوردییەکە و تێکستە ئینگلیزییەکە دەتوانیت خۆت ڕابهێنیت لە چۆنێتی تێگەیشتن لە نوسینێك کە بەزمانی ئینگلیزی نوسرا بێت.


لەبلاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (٣٠٠٠)دینار